# دیوانی نالە حەسەن

## بەرگی یەکەم - ١٩٩١ - ٢٠٠٩


● بابەت: شیعر
● نووسینی: نالە حەسەن
● دیزاین: ئاکار جەلیل
● چاپ: یەکەم/ ٢٠٢١
● تیراژ: ١٠٠٠ دانە
● نرخ: ٥٠٠٠ دینار
● چاپخانە: چاپخانەی تاران/ تاران

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (    )ی ساڵی ٢٠٢١ی دراوەتێ

# من کاروانی بەشمەینەتان جێناهێڵم

هۆ دڵدارە داماوەکەم
هەتا دوێنێ من زمانی
دابڕانم نەدەزانی
هەتا دوێنێ ژانی کۆچ و
شەوی تەنیام نەدەزانی
سەردەمانێک لەنێو نیگای چاوەکانت
تروسکایی ئاسۆم ئەدی
سەردەمانێک لە قەدپاڵی دڵی ماندووت
کانی ڕوون و گەشم ئەدی
دەڕژایە نێو ئۆقیانووسی شاری دڵم
دەڕژایە سەر کێڵگە و باخی خوێن و لەشم
ئەی ئێستاکە بۆ ناپرسی

تروسکایی ئاسۆی چاوت
چی بەسەرهات
ئەی ئێستاکە بۆ ناپرسی
ئاوی ڕوونی کانی دڵت
بۆ کوێ دەڕوات ..؟
هۆ دڵدارە غەریبەکەم
من کۆچەر نیم
من شوانکار نیم
لە پێدەشت و لە بناری
چیای سەختی بێ ناونیشان
ڕەشماڵی خۆمی تیا هەڵدەم
( کۆڵۆمبسی ) گەڕۆکیش نیم
بەدوای کیشوەران ڕابکەم
من نیشتەجێی شاری
گڕگرتووی بەهارم
من نیشتەجێی خیابانی پڕ هاوارم

من وەکو تۆ

کەڵاوەکە و خیابان و هەوارگەی خۆم

شەقامی خۆم جێناهێڵم ..!

من وەکو تۆ

ئەو دڵدارەی لەسەر سینەی ماندووی منا

چاولێک ئەنێ جێی ناهێڵم ...!

من وەکو تۆ

دانابڕێم لە کاروانی هۆزی گەورەی

بەشمەینەتان

مل کەچ ناکەم بۆ نەریت و یاسای کۆنی

بۆرژواکان

من ئەمرۆکە

گرووتینم بۆ مەشخەڵی کارخانەکان

تیشکی خۆرم بۆ پەنجەرەی هەژارەکان

بۆیە هەرگیز
من کاروانی بەشمەینەتان جێ ناهێڵم
من هەوارگەی پڕ هاوارم جێ ناهێڵم
جێ ناهێڵم
جێ ناهێڵم
جێ ناهێڵم ...!

١٩٩١ / ٩ / ٦

## کازیوه

چەند ساڵێک بوو
بەفر لەژێر پێم دەباری
پەنجەکانم
لەگەڵ تۆپە بەفرەکانی لوتکەی ژێر پێم
ئاوێزانی یەکتری بوون
بە بناری سەر لاپەڕەی
ڕەشی ژینم دەهاتنە خوار
ئێستا پەنجەم
لە زمانی بەفر ناگات
هەموو تۆپە بەفرەکانی لوتکەی ژێر پێم
لەنێو شانەی پەنجەکانم دەتوێنەوە
ئێستا سەرەتای مانگی بەفرانبارە

ڕۆژی لەدایکبوونی پەنجەکانمە
جارێکیتر
گۆنای سووری پەنجەکانم
بە ئاوی ساردی ناخی بەفر ناشۆمەوە !

**٨ی بەفرانباری ١٩٩٣**

# هەناسە و شیعر

چۆن بە زمانی عەشق نەدوێم
کە من
چیرۆکی بەرئاگردانی شەوانەی
عەشقی سەردەم بم
چۆن لە ئامێزی نهێنییەکانی عەشق نەژیم
کە بتوانم
لە تەوێلەی ساڵەکانی ڕابردووما
لە ناو مشتێ خۆڵەمێشا
شکۆفەی ئاگر بێنمە گۆ
لەو ڕۆژەوە عەشق
لە نێو سوچی

لازە ساکارەکەی شیعرەکانم
پێی گرتووە
هەر لەو ڕۆژە
شیعر پەرچەمی نازی باڵای عەشقمە
عەشقیش
سێبەر و هەناسە و
برژانگی چاوی شیعرەکانمە
چۆن بە زمانی عەشق نەدوێم
کە وەکوو مانگ لەلام ڕوون بێ
وزە و هەتاو
قەت ناتوانن دەستبەرداری
یەکتری بن ...!

**١٣ی ئۆگستی ١٩٩٣**

( ...................... )

ئێرە وێستگەیەکی ترسناکە
پێکەنینە وەنەوشەییەکان
گەردەلوولێکی سەرشێتن
بە بەردەمما
تۆز دەکەن و ڕادەبوورن
ژیان لێرە
تۆپە دەزوویەکی گرمۆڵەیە
تنۆک تنۆک ئاوی ڕەشی
لێدەچۆڕێ
شەو ڕادەکشی
بەسەر سینگی یادگارەکان

ساتەوەختێک
دەنگی خشپەی پێڵاوەکانی منداڵان
نایەتە گوێ
لێرە ختووکەی ڕۆحی شیعر
زۆر دەگمەنە
شیعر زام و قەتماغەیە
بەناو چاوی شار دەبیندرێ

**١١ی تەمووزی ١٩٩٣**

# سەمفۆنیا زیندووەکان

ئێوارەیەک
لەو پەنجەرەیەی هەمووجارێ
گۆشە دیدگای ڕوانینم بوو
ڕەوە کۆترێکی سپی دەنووک سوورم بینی
بۆی دانیشتم
چاوەکانم ئاوی تێزا و
لە بینینیان بێزار نەبووم
هێندە جوان و ئێسک سووک و شیرین بوون لام
بەرەو یادەوەری منداڵیم ڕایان کێشام
گوێم ڕاگرت بوو لە سەمفۆنیای بوغەبوغیان
بینیم ئەو دەنگ و ئاوازە

لە دەروازەی گوێچکەی دڵم نامۆ نییە
لەوەتەی هەم پێی ئاشنامە
لەوەتەی هەم
کە ئاژینە کارخانەکان
خەو لە چاوی شار ئەڕژێنن
لە ناو کوچەی گەڕەکەکەم
لە ناو تونێلی ژینگەمان
ئەم ئاوازەم گوێ لێ دەبێ
دوا قۆناغی کاروانەکەی تیشکی خۆریش
ڕوەو هەوراز ڕێی گرتبووە بەر
باڵای شارم لەسەر سینگی شەو ڕاکشا
تا ئەوکاتەش نەمدەتوانی
پەنجەرەکەم جێبهێڵم
هەستم دەکرد ژێیەکانی ئەم ئاوازە
بەناو بۆڕی خوێنی لەشم مەلەی دەکرد

لەگەڵ گەردی
سییەکانم تێکەڵ ببوو
لە شوێن خۆما باڵەفڕکەم پێ کەوتبوو
چەندی دەمکرد
لە بینینیان تێر نەدەبووم
ئای کە دنیایەکی سەیر بوو ..!!

١٩٩٣ /٣/٤

# گۆرانییەكانی دوێنێ و ئەمڕۆ

لە سەردەمی قات و قڕی و گرانی دا
وەیشوومە بوو
بۆ هەناسەی چرۆی ساوای
نێرگزەكەی چاوی بەهار
گشت ڕەهێڵەی خەمەكانمان
بوون بە باران
گشت كرێوەی زامی قووڵی لێوەكانمان
بوون بە تۆفان
ڕق لە چاوی شەقام هەستا و
دار و دیوار هاتە هەژان
هەور گریا و
مانگ پێكەنی

ئەستێرەکان پێکی شنەی
گوڵەگەنمی شاریان نۆشی
باڵندەکان پڕ بە گەروو
هەوای بێگەردی پاش بارانیان
تێر هەڵمژی
کەچی هێشتا
هەموو شەوێ
گۆنای زەردی ڕەنگ مردووانەی
سیمای شارم
وەک ئاوازی شەپۆلەکەی دەریای ناخم
لەبەر چاوما دێت و دەچێ
هەموو شەوێ
گوێم لە هاژە و گوێم لە ورشە و
ناڵە ناڵی ڕووبار دەبێ
گوێم لە نووزەی

ماسیە بچکۆڵەکان دەبێ
دەڵێن هاوار
وەکوو جاران
هەر نەهەنگە پاشای ڕووبار
هەر نەهەنگە خاوەن بڕیار ...!

١٩٩٢ /٦/٧

# پارێزەرانی داربەڕوو

بۆچی هاتوون
وا ئەزانن
قەڵای کۆن و منارەکەم
زنجیرە چیای سەر سنوورن
وا ئەزانن
کەلاوەکانی شارەکەم
گوندەکانی بەڕانەتی و گەرمیان و شارەزوورن
ئێوە ...
گەردەلوولی بیابانن
یان ورشە ورشی داربەروون
ئێوە
لە شەقامی شارەکانی

چاو و گەدە و ناخی ئێمە
نابەلەدن
بۆچی هاتوون
کە نەتوانن دڵی گریەی خەونی سەوزی
لێوە شەقاربووەکانمان ژێرکەنەوە
کە نەتوانن
گلێنەی دزراوی چاوەکانمان
بدۆزنەوە
ئێوە هاتوون
گەرووی تەڕی کانیاوەکانمان لێ بگوشن
یاخود هاتوون
قوڵابی ژەنگاوی چڵکن
لە ماسی یە بچکۆڵەکانی
موخمان گیرکەن
بۆچی هاتوون

دەبڕۆنەوە
بێشکەی چیا بهەژێنن
داربەڕووەکان بپارێزن
لە ئەشکەوتی قەدپاڵەکان
ئاهەنگەکانتان بگێڕن ...!

١٩٩١/٩/١٢

# عەشق و نان

ئەی قەشەنگترین کچی عەشق
ئەگەر ژانی حەماموکێ و سەر پشتی نانم
لە ناو چاوت شک نەبردبا
بەدوای سۆراغی گوڵەگەنم نەدەهاتم
ئەگەر ژانی گوڵەگەنمیش ٠
سەدای ورشەی
کانی خەندەی سەر لێومی قڕ نەکردبا
بەدوای عەشق و بۆ هەوارت نەدەهاتم
چەند پیرۆزە عەشقت لە لام
کە دەبینم
بۆنی نان و گوڵەگەنم
لە کورەی دڵت هەڵدەستێ

منیش دێم و
وەک چۆلەکە
بۆ ئاسمانی شینی چاوت
بە باڵ دەفڕم
شنەی هەور
شنەی باران
گوێم کاس دەکەن
هاژەی ڕقی فرمێسکەکانی ئەستێرەش
لە دەریای چاوت ماندەگرن
ئەی قەشەنگترین کچی عەشق
گەردی بارانی عەشقی تۆ
کەژاوەکەی مژدەبەخشی دنیای نوێیە
بەسەر گیانمان دا دەبارێ
زایەڵەی زەنگی عەشقی تۆ
بزەی شادی

یەکەم ڕۆژی مانگی مەیە
بەسەر لێوی
عاشقانی تامەزرۆی نان دا دەباریێ
دە بەڕێخە
کەژاوەکەی پڕ لە عەشقت
تاکو گیانمان
لێوانلێو لە عەشقی تۆ بێ
دە بەڕێخە
تاڤگەی ڕوونی پڕ لە عەشقت
تاکو چرۆی گوڵەگەنم
لەسەر لێوی دڵت بڕوێ ...!

١٩٩٣/٤/١٥

# سەفەرێکی بێکۆتایی

لە هاوینێکی بێ کەپر
تروسکایی ئاگرێکت لەناو چاوی
خەون بینی
بۆی ڕۆیشتی و
ئەودیو سنوورەکانت پشکنی
نەهاتیەوە
خۆت خزاندە
نێو بیابانێکی ڕووتەلە
هەموو ژێر پنچە دڕکەکان و
ژێر گومبەزە زیخەکانت دەپشکنی
نەهاتیەوە
تاکو باڵات بوو بە قەدی دار حەیزەران

چاوت بووە چاوی چاڵی ئەشکەوتەکان
هەر ڕۆیشتی
تاوات لێهات
وەک ئەشقیا
سواری پشتی هەڵۆیەکی مشەخۆر بووی
شاخ بە شاخ و دۆڵ بە دۆڵت دەپشکنی
نەتدەزانی
بەدوای سێبەری خۆت دەگەڕێی یاخود بە دوای
تیشکی ئاگرە ونبووەکان
نەتدۆزییەوە
چونکە باڵای هیواکانت بێ سێبەربوون
هەگبەی حەزی ڕۆژانی زووت
لە هەواری پێش سەفەرت بە جێمابوون
گەڕایتەوە
بۆ بناری یەکەم هەوار

کە هاتیەوە
نە هەگبەکەی بەجێماوت
نە سێبەری پێش مردنت
هیچت نەدی و نەتدۆزیەوە
بۆ دەگەڕێی
چۆن دەتوانی تۆوی پشکۆی گوڵەکانت
لە ناو کێلگەی لم و زیخی بیابانان
بدۆزییەوە ...؟

١٩٩٢/٢/٥

# ئۆپەرێتی شەو

بۆ ئۆپەرێتی شەوانەم
دێیت و
گۆرانیم بۆ دەڵێی
یاخود بسکت بۆم دەکەیتە
تەلی کەمانجەیەکی شکاو
لە بناری چیای ڕۆحم
ئاوازی مەرگ دەژەنی
بزەی سیمای پڕ لە شەرمت
چەندە جوانە
هەموو ڕۆژێ
لە ژێر گڕی بێشکەی گەرمای

وەرزی هاوینەی سەرمایە
بەدیار سەبەتە کولێرەیەک
هەڵکورماوی
زنجیر لە دەست و پێی خۆت دەدەی
لەگەڵ شنەی شەپۆلەکەی
کارێزی گۆنای برسیەتی
سەما دەکەی
هەور لە بسکت ئاڵاوە
بسکت ڕەنگی
باڵای ڕەشی سێبەرێکی ترسناکە
کە شەوانان
لەبەر دەرگای ژوورەکەم دا
پاسەوانە
لەودیو شیشەی پەنجەرەکەش
ڕۆچوون بەرەو ناخی هەتاو

توانەوەی مۆم
تەوژمی لافاوی تووڕەیی
ڕاکشان
لە ئامێزی دەفتەری شەو
بینینی دوو چاوی زەقی
شیعرێکی نوێ
کە بە خەتێکی شاش تیای نووسراوە
هەر شوورایە هەنگی تێنوو
بەدوای شیلەی گوڵی هیوای
سوور دەگەڕێ
هەر شوورایە
ئاڵای سووری ئاسۆی گەشمان
لەنێو لەپی دەستە شەقاربووەکانمان
توند ڕادەگرێ ...!

۱۹۹۳ / ٥ /۲۲

# چرپەو ناڵەی هەموو شەوەم

بەهارە و مانگی گوڵانە
لە کڵاوڕۆژنەی
هیواو خواستی دڵدارەکەم
گەڵای سەوز و
دەسکە گوڵی سوور دەبینم
ئێستاش شەوە
گوێم لە ناڵە و گوێم لە چرپە و
لە گۆرانی ئەم شەوگارە ڕاگرتووە
گوێم لە نەغمەی
دڵ تەزێنی ئەو دایکانە ڕاگرتووە
دەڵێن لای لای

جگەرگۆشە بێنازەکەم
بنوو ڕۆڵەم بنوو کۆرپەم
شەو درەنگە تا بەیانی
دوانەکەوم لە کارەکەم
بەهارەو مانگی گوڵانە
کەمەرەکەی باڵای شارم
سەوز ئەنوێنێ
گۆرانییە بەسۆزەکەی
عاشقانی ئەم ڕۆژگارە
بێشکەی شیعرم ڕائەژەنێ
ژانی نانی بەیانیشم
وەتەری بیرم ئەپسێنێ
ئێستا شەوە
تۆزێکی تر ڕۆژ دێتەوە
دڵدارە لەش تۆزاویەکەم

بۆ کۆلێرەی
سەیرانێکی ئەم بەهارە
لە بەیانی تا ئێوارە
ئەبێ پەنجەی ناسک و نەرمی
قژی لوولی ئامێرەکان شانە بکا
بە ناچاری هەموو ڕۆژێ
لە مەیدانی هێز فرۆشتن
هێزی لەشی مەزاد بکا
هۆ دڵدارە
گۆنا سوورە خۆربردووەکەم
لەم بەهارە
خێلی ماندووی شارەکەمان
بەدوای لەتێ نان ڕادەکەن
مشەخۆرانی
نەزمی نوێش

بۆ بەهاری سەرمایەیان
کۆشکی زێڕین
لە بلۆکی ئالتووناوی
دروست دەکەن
دڵدارەکەم
سەیری زەماوەندی شارکە
بە ئامێری دەستی ئێمە دەهۆڵ دەکوتن
بەهێزی هەموو ڕۆژەی لەشی ئێمە
زوڕنا دەژەنن
هەموو ڕۆژێ
لە تەلبەندی نێو ڕۆحی شار
هێزی مرۆڤە شاباش دەکرێ
لەم وڵاتە پڕ لە زامەم
هێزی مرۆڤ لەتێک نانە و.
کەس نایکڕێ ...!

**بەهاری ١٩٩٢**

# مۆمێکی نوێی تەمەنم

**بۆ / خولیا حسێن**

ئەم شەو ناخم
لە مەنزڵگای
گۆڕەپانی لەپی دەستم
گڕ بەردەدا
لە مۆمێکی نوێی تەمەنم
ئەم شەو ناخم
لە بەردەمی بڵندگۆکەی هیواکانم
فوو بە شمشاڵێکی نوێ دەکا
لە گەڵا وەریوەکانی ئەم خەزانەم
دەسرۆکەی سوور دروست دەکا
ئەم شەو هەموو دەمارەکانی لەشم
دەروێشانە گڕیان گرتووە
سەربادەدەن

هەڵدەپەڕن
وا خەریکن ئاشی دڵم بە گڕ بخەن
ئەم شەو لەسەر شانۆی هۆڵی دڵم
زەماوەندە
وەک دوێنێ شەو
ناچمە ژووان و
ڕاناکشێم لە ئامێزی باوەشی خەو
ئەوە دەنگی کازێوەیە
وا لە دەرگای شەوم دەدا
دەسەیر کەن
ئا ئەوەتا دەسگیرانم
وا لەناو چاوی کازێوە
دانیشتووە و بانگم دەکا
من لەمەودوا
هەموو شەوێ
قژی کازێوە بۆن دەکەم

هیواو حەزی دەسگیرانم
وەک ملوانکە
لە گەردنی شیعرم دەکەم
من لەمەودوا
لە سێبەری شەو ناترسێم
لە بێدەنگی ژووری تەنیام
سام نامگرێ
ئا ئەوەتا دەسگیرانم
لە ناو چاوی کازێوەیە
بەرەو پێدەشتی ناخم دێ
من لەمەودوا
بۆ ڕابردووی خۆم ناگرییێم
بە گەردن و باڵای شەوم دا هەڵناڵێم
بە تەنیایی
لەژێر ڕەشماڵی هەوری خەم

ڕاناکشێم
من لەمەودوا بە تەنیایی
ڕێگای دووری سەختی شەوگار
ناگرمە بە
بە تەنیایی
لە قەدپاڵی هیواکانم
بەرەو ئاسۆ
بەرنابمەوە
ئا ئەوەتا دەسگیرانم
لەناو چاوی کازێوەیە
بەرەو هەوارگەی ناخم دێ
تا پێکەوە
شیعری نوێ
بۆ هەناسەی خۆری هیوا بڵێینەوە ...!

١ / ١٢ / ١٩٩٢

# بۆ تۆی هاوبیرم پێشکەشە

چاوەکانت
ئاوێنەی کەناری ئەو ڕێ یەیە
لەگەڵ کاروانێکی دوور و درێژ پیایا دەڕۆم
ناوە ناوە بۆی دەروانم
شێوەی خۆمی تیا دەبینم
چاوەکانت
سەرچاوەی ئەو کانی یەیە
کە هاوینان
لەژێر گڕوو تینی گەرما
لەسەر ڕێگاکەی ئاسۆی ڕێ
تاسە و تێنوێتیم دەشکێنێ

مەترسە
کە چاوەکانی تۆیان هەڵکۆڵی
من دەخزێمە نێو ئەشکەوتی
چاوەکانت
شووشەی چاوەکانی خۆم دەردەهێنم
دەیکەمە دووربین و لە دەروازەی
چاوەکانی تۆ دایدەنێم
بەیەکەوە پێی دەڕوانین
چونکە سۆمای چاوەکانمان
یەک سۆمایە
دیدگای هۆش و هەست و بیرمان
یەک دیدگایە
ترس بۆچی
هۆ هاودڵ و هاوتروسکەی
چاوەکانم

دڵنیامە هەموو شەوێ
کە نامەکەم دەکەیتەوە
چەند دڵۆپە فرمێسکێک
وەکو شیلە
دەرژێنە سەر پەنجەکانت
ئەوکاتەی تۆش
پەنجەکانت بەنێو شانەی ڕەشماڵەکەی
قژەکانت دادەهێنی
شیلەی پەنجەت بە قژی خاوتەوە دەنووسێ
ئەوەتانێ
قژت بۆنی فرمێسکەکانی منی لێ دێ
ئەوەتانێ
قژت تیشکە ڕەنگی فرمێسکەکەی
منی لێ هەڵدەستێ
مەترسە

ناخت بەهارێکی چوار وەرزییە
بە تۆوی گەشی هاوبیری
بە هەناسەی گەردیلەکەی بزەو فرمێسک
حاجیلۆکە و کوریکی هیواکانمی تیا دەڕوێ
بۆیە جووت جووت
ئاوێتە بووی عەشق ئامێز
بۆ بەختیاری ئایندەمان
لەنێو ناخت سەردەردێنێ ..!

١٩٩٢ / ١١/٢٤

# شەوگار و چرا

بۆ پێت وتم
منم چرا
بۆ پێت وتم
بۆ تریفەی مانگە شەوت
بۆ کازێوەی بەیانیانت
دەکەم سەما
بۆ پێت وتم
بۆ بینینی تروسکایی
گشت ئەڵماسی دەریای ناخت
دەبمە نیگا
بەڵام چیبکەم
کە نەتتوانی

لە شەوانی ژینی منا
ببیە چرا
بۆ تریفەی مانگە شەوم
بکەی سەما
بۆ بینینی ئاسۆی گەشم
ببیە نیگا
تۆ چرا نیت
ئەگەر گشت کات
لەبەردەمی کاروانسەرای
ڕێی هەزاران
دانەگیرسێیت و نەسووتێیت
تۆ چرانیت
گەر ئاوازی کەمانجەکەی
گشت منداڵە برسیەکانی
ئەفەریقیا نەگاتە گوێت

دەسەیر کە
سەیری هەگبەی دەروونم کە
چۆن سرووده زیندووەکانی
ئەم جیهانەم لە کۆڵدایە
سەیری فرمێسکی چاوم کە
چۆن گەردیلەی
هەورە بارانی بەهاری لەگەڵدایە
تۆ چرا نیت
هەموو شەوە تاریکەکان
شەوە ئەنگوستە چاوەکان
لەناو باوەشی تۆدایە
دە سەیرکە من چرامە
لەناو خانووە قوڕەکانی هەژاراندا
دەسووتێم و
لەگەڵ دەستەی کاروانی نوێ

هەنگاو دەنێم
لە شەوگاری ئەنگوستە چاو
داگیرساوم
بەبێ وچان
هەر دەسووتێم
هەر دەسووتێم ...!

١٣ / ١٠ / ١٩٩١

# بەیانی

**بۆ کرێکارە مانگرتووەکانی ( دەواجن )**

دڵدارەکەم
لە ئەرشیفی پەرتووکخانەی
چاوەکانت
چەندین نامەی منی تیایە
لە کەشکۆڵی نێو سەرابی
شەقامەکانی چاوی تۆ
چەندین شیعری منی تیایە
ئەو ڕۆژانەم دێتەوە یاد
لەژێر سیبەری هەوری زام

هۆندراوەم بۆت دەخوێندەوە
دەستت لەنێو دەستم نابوو
دەستەکانمان
جۆلانە بوون بۆ منداڵان
خەم لە سیمای دایکەکانمان دەرەویەوە
هۆ دڵدارە کۆچکردووەکەم
شیعرەکانم بنێرەوە
هەتاوەکو
لە دەفتەری نوێی ئەمرۆم بینووسمەوە
منداڵانی گەڕەکەکەم بێ جۆلانەن
هەموو دەگرین
هێزفرۆشانی شارەکەم
خەم دایگرتوون بێ موشتەرین
دڵدارەکەم
شیعرەکانم بنێرەوە

تا بەیانی
بۆ مانگرتووانی ( دەواجن ) و
بۆ منداڵانی سەر شۆستە و
بۆ دەستفرۆشانی بەر هەتاو و
بۆ برسیەکانی شارەکەم
لە گۆڕەپانی ( شێخ الله )
بیخوێنمەوە
دڵدارەکەم
شیعرەکانم بنێرەوە
تا بەیانی لەگەڵ هاوڕێکانمان
بەناو چاوی شار بیگێڕین
چونکە سبەی
لەگەڵ سەدای دەنگی ئێمە
ئەم ولاتە ڕائەچلەکێ و
کۆشکی لەرزۆکی بۆرژوا

دێتە لەرزین
دڵدارەکەم
شیعرەکانم بنێرەوە ...!

**لە ژمارە ( ٣ )ی گۆڤاری ( نینا ) بڵاوبۆتەوە**

# با چراکان گەش کەینەوە

کە منداڵ بووم
دایکم باسی
دێو و جنۆکەی بۆ ئەکردم
لە باوەشی کەلاوەیەکی سارد و سڕ
هەموو شەوێ ئەیترساندم
کەچی ئێستاکەش
وەک جاران
هەمان ترس هەمان ئیلهام
لەبەر چاوما
وەک تیاترۆ سەما دەکا
سەیرە
خۆ ئێستاکە نە شێتم و نە منداڵم

بەڵام
بە چاوەکانی خۆم دەیبینم
لە ئۆردوگای نێو ئامێزی ئەم وڵاتە
ڕۆژێ سەدان کەس شێت دەبێ
شەقام بۆنی خوێنی لێدێ
بۆ کوێ بڕۆی
تابلۆی ڕەش و نوزەی مەرگ
بەرەو ڕووت دێن
نەکەن بە شێتم تێبگەن
دایکم ئەیوت
دێو دەتوانێ مرۆڤ بخوا
لەسەر لاشەی مرۆڤ دەژی و
لە دوورەوە قووتی دەدا
دێوەکانی ئەم سەردەمەش
بە کاسە سەری مرۆڤ

کۆشک و تەلار دروست دەکەن
ڕەنجی ئێمە
خوێنی ئێمە
شەڕابی پیاڵەی ڕۆحیانە
لە ئاهەنگی شەوانەیان
نۆشی دەکەن
بۆچی شێتم
بە چاوی خۆتان سەیریان کەن
ئا ئەوەتان
وا لە ئەشکەوتی ناو کۆشکن
ڕێک ئەوانن
لە دێو و جنۆکەکەی
چیرۆکەکەی دایکم دەچن
هۆ هاوڕێیان
ڕێبوارانی ماندوو نەبووی ڕێگا دووری

ئەم سەردەمە
عاشقانی کەشکۆڵ لە کۆڵ
پشت کۆمانی هەگبە پڕی
پڕ لە زام و پڕ لە ژانی ئەم سەردەمە
ئا دەی وەرن
تا پێکەوە
لە ناو دڵی
شەوەزەنگی دارستانی ئەم سەدەیە
چراکانمان گەش کەینەوە
جارێکی تر
ئاوی سواندەی شوراکانمان
بخۆینەوە
تا تریفەی مانگ دەرکەوێ و
گەڵای هەموو درەختەکان بژێیێنەوە
هاورێکانم

دێوەکانی ئەم سەردەمە
چاویان وەکو
چاوی شەمشەمەکوێرەیە
کە گزنگی چراکانمان
لە پێدەشتی شورا هەڵدێ
گشت کوێر دەبن
چاویان تیزابی تێ دەخزێ
ئادەی وەرن
با چراکان گەش کەینەوە
تا شانە بچووکەکانی ڕۆحمان
بژیێنەوە
بۆ یەکچاری ڕزگارمان بێ و
کاسە سەرو لاشەکانمان
لەیەک جیا نەکرێنەوە

١٣/ ١١ / ١٩٩٢

# گوڵ باران

لە ناو هەگبەی بورکانەکەی
دڵی تەمووز
لە ناو کورەی هەناسەی گەرمی ئەم مانگە
شنەبایەکی فێنک
بە سەر سیمای ئەم شارەدا خۆی دەنوێنێ
پەلە هەورە زیندووەکان
بۆنی بارانێکی تەڕ هەڵگرتوو
ئاسمانی شار دادەپۆشێ
لە کوخەکان وەرنە دەرێ
گەرمای تەمووز هوڕتان دەکات
لە ناو هەگبەی بورکانەکەی دڵی تەمووز
گوڵ بارانە

هەناسە و دڵە خورپەی پڕ لە زامتان
شەپۆلی ڕق و تووڕەییتان بۆتە سروود
بۆ نەمانی دنیای بەستەڵەکی کۆن
جاڕ لێدەدا
وەرنەدەرێ
لەگەڵ ڕێژنەی بارانەکان
گوڵ دەبارێ
لە سەر خونچەی هیواکانی لێوی ئێمە
لە ناو چاوە دووربینەکەی گەشی ئێمە
مەشخەڵی ئاگر هەڵدەستێ
شەپۆلە پەنگ خواردووەکانی ئەم چەرخە
بۆتە لافاو
لە سەر پشتی دڵۆپە ئاوە گەرمەکان
گوڵی ( کۆمۆنە ) دەبیندرێ
وەرنە دەرێ

خرۆشانە
لە ناو سەرابی دڵی گەورەی ئینسانەکان
شار یەکپارچە گڕوو تینە
مەرگی پارێزەرانی نەزمی نوێ
گۆرانیەکی پڕ لە عەشقە
وێردی سەر زمانە تێنووەکان و
ئاوازی بڵنگۆی ناو کارگەکانە
وەرنە دەرێ
لە ژێر چەتری ئەم هاوینە
ڕیز ببەستن
شار کراسی سووری کۆمۆنەی
چەرخی نوێی کردۆتە بەر
ئازادی و یەکسانی ئینسانەکان
پشکۆی گەشن
لە ژێر سێبەری ئەم چەترە

پێدەگات و سەر دێنتەدەر
وەرنە دەرێ
دنیا گەرمە
شنەباکەش زۆر فێنکە
بەڕیز خۆتان بدەنە بەر
لە ناو کورەی هەناسەی گەرمی ئەم مانگە
گوڵ دەبارێ
وەرنە دەرێ
لە پشتی یەک ڕیز ببەستن
تاکو یەک یەک گوڵی هیوای خۆرەتاوی
بەهاری سەوزی هەتاسەرتان بەربکەوێ ...!

**٣٠ ی تەمووزی ١٩٩٣**

**پێشکەشە :-**

ڕەشبەڵەکی ڕۆح .. پێشکەشە
بەو پەپوولە بێگوناهانەی کە غەریزە چەپێندراوەکانیان
بە شیعر تێر دەبێت و لە نێو لەزەتی ڕۆحیدا دەتوێنەوە ...!

# (کەژاوەی خۆرەتاو)

بە پەیژەیەکی بازنەیی
بێ سەرەتا و
بێ کۆتایی سەردەکەوم
تەمەنم لە ناو تەونی جالجالۆکەیەکی
ڕەنگ خۆڵەمێشی دەڕشێتەوە
زورناژەنەکانی چەرخی بەردین ، بووکەشووشە
لە تارمایی شەو دروست دەکەن
من و شیعر و من و دایکم
لەگەڵ فرمێسکە بارانی ئەم سەردەمە
بە خشخشۆکێ
بە سەر گۆنای مانگ دێینە خوارێ

لە هوتێلی شەقامە سەرابیەکانی ئاسمان بێزارم
نە چرکەی کاتژمێرێک
نە خورپەی دڵی باڵندەیەک
نایەتە گوێم
خەونەکانی پێش لە دایکبوونی خۆم
بە بیرنایە
هەتاوی بەیانییە بەفرینییەکان سەرخۆشن
ناوکی درەختی مەلۆتکەی دڵم
بە تفەنگ دەبڕن
سەماکارە چیاییەکان
لەژێر ڕەشماڵێکی دڕاو
بنێشت دەجوون
سەروتیتکیان تێکئاڵاوە و
تادێ زێتر ڕووت دەبنەوە
شەپۆلی ڕووباری شیعرم

له سەرەتای مانگی شەختەبەندانی هەرچوار وەرز
بەئاگردانی سەر سینگی گەورە کچان
خۆی گەرم دەکاتەوە
مێژوو ، گەردەلوولێکی دەروێشییە
له ناو دەمارەکانی سەرم دەست پێدەکات و
له سەر پێڵووی چاوەکانم کۆتایی دێت
پێش ئەوەی له دایک بم
خۆڵی سەر دیواری گومبەزەکانیان دەکردە چاوەکانم
به چڵکاوی جۆگەلەکانی شەوەزەنگ
نینۆکەکانمیان ڕەنگ دەکرد
پاییز ، وەرزێکی غەریب و بێدەنگە
پاییز دایکمە ، دوێنێ به سکی ئاوسەوە
هاته لام و تێر تێر گریا
منیش گۆنا به چرچ و لۆچەکەییم
تێر ماچ کرد و بەشانەی خۆرەتاوی ڕۆحم

پرچە سپییە بێگوناهەکەییم داهێنا
لەم ئۆردوگایە تەلبەندراوە
ئاسمان ڕەشە ، هەور ڕەشە
لە دایکبوون ڕەشە
خۆرەتاو تا دەگاتە جێژووانی کازیوە
دەبێ بەسەر لاشەی شەو ڕێ بکا
بزنە کێویی نێو ئەشکەوتە تاریکەکانیش
ڕقیان لەو ڕووبارانە دەبێتەوە
کە هەموو بەیانیان خۆیان ڕووت دەکەنەوە و
لەسەر گازی پشت لێی ڕا دەکشێن
تا خۆرەتاو دێت و ماچیان دەکات
ڕقیان لەو پەپوولە و لەو بنجە گیایانە دەبێتەوە
کە لەگەڵ گۆرانیەکانی ڕووبار
بە خەبەر دێن و
هەر بە ڕووتی دەکەونە سەما

من کە هاتم
بە پێخاوسی دەگەڕام
شەقامەکان بە وردە شووشە دانەپۆشرابوون
دڕکەلوکی میمی پاشگر ، لە هیچ ئاقارێک دیار نەبوو
کچ و کوڕ پێکەوە دەچووینە ڕێواسان
بە ڕەهایی سەرم بە کۆشی دەسگیرانەکەمدا دەکرد
لەناو چاوەکانیدا
گوڵی بەهەشتیم بۆن دەکرد
من کە هاتم
گەرم پێوەکان بە درۆ گەرمایی لەشمیان
نەدەخوێندەوە
هێندە وەکو منداڵ
حەزم لە سواری چەرخ و فەلەک نەدەکرد و
لەناو پەیژەی بازنەییدا

ئەژنۆکانم شل نەدەبوون و باوێشکم نەدەهات
ئێستا باوەڕم بە لێدانی دڵی خۆم و
دڵی پەپوولە نەماوە
چاو لە یەکەم وێستگەی هاتنم دەگێڕم
برژانگەکانم دەسووتێن و ئەوسەری شەقامە
قیرتاوکراوەکەی خۆم نابینم
ئێستا ، بەفر پێکەنینی مردن
لەسەر لوتکەکان جێدەهێڵێ
بە چاوەکانی خۆم لە ناو دڵی زەوی
مەشخەڵی ئاگر دەبینم
لێمگەڕێن
با تەزووی ماچی لێوی خۆم و
لێوی گوڵەباغ لە هەنگوین هەڵبسووم
دەمم دامەخەن ، زمانم مەبڕن ، قەڵەمەکەم مەشکێنن
با کرمی ناو سێوە ڕزیوەکانی شەوەزەنگ بێنمە دەرێ و

لەگەڵ پووش و پەڵاش و پەلەهەورە ڕەشەکان
لەبەردەم با دایان بنێم
دەلێمگەڕێن
من بروسکەم
من خوێنی ناو دڵی منداڵێکی هەرزەکاری ڕەنگ زەردم
پەراسووەکانی گوڵەگەنم و
هەناسەی تاڤگەی ئەوینم
دەلێمگەڕێن ، فرمێسکم ئاوی حەیاتە و گۆزەی تەنیاییم
لەسەر کانیەکانی ئاسمان مەشکێنن
قیژ لە لایلایە و لە گۆرانیەکانی شەوانم
مەکەنەوە
من لە سکی ڕەشماڵی با لە دایکبووم
لەسەر پشتی ڕووبار مەمکی ئەستێرەکانم مژیوە
ئەو دەمانەی کەزییە درێژەکانی تاریکی دەبڕم
شەو لەبەر سێبەری مەرگ

چاوم لێ سوور دەکاتەوە و
فتوای کوشتنم دەردەکات
من نامرم ، وا تازەبەتازە بەفری کەنار
هەردوو مەمکەکانم دەتوێنەوە
وا تازەبەتازە
مژدەی چوونە ناو چاوی هاوارم هێناوە
لە شەوی ئاوزینگدانی ئادەم
لە شەو ئاوزینگدانی مەرگ
من پەیامی ( شەوە سپیەکانی ) خۆم
بڵاو کردەوە و
شنەبای ئارەزووەکانی خۆم بەرەڵا کرد
لەگەڵ ڕووەک و باڵندە سپیەکان
بەرەو ئاسمانێکی سپی ساماڵ وا کۆچ دەکەین
شەو لەبەر ڕۆشنایی ڕووبارە سپیەکان
نەیتوانی بزێ

شەپۆلی ڕووباری کازێوە
لە شەوی ئاوزینگدانی تاریکی لە دایک بوو
شەوەزەنگ مرد
شەوەزەنگ سکی ڕەشی
چەندین ساڵەی لەبارچوو
ئێستا هەموو ئەستێرەکان و
کەژاوەی خۆرەتاو و ڕەنگی زیوینی بەفر و
بزەی باران دەزانن
شەوەزەنگ نەزۆکە ...!
ئێستا ، بریسکەی چاوی پشیلە و
کڵپەی سووتانی شیعر و
خوناوی سەر پەنجەرەی عەشقە ئەبەدییەکان
دەزانن
شەوەزەنگ نەزۆکە نەزۆک٠
گەر سەری من بانێژەی ئاسمان با

نەمدەهێشت
بە پەیژەی نامۆیی و خۆکوشتن سەرکەون
ئاوێنەی پرچی شەو دەرکەوێ
نەمدەهێشت
لە نیگای مانگەشەو
تابووت بۆ پەنجەکانم دروست کەن
بزەی خەم گەردانەی
گەڵا ڕیزانی ڕۆحتان بێ
دوێنێ شەو
خۆرەتاو لەناو سێبەرم نووستبوو
ئەمڕۆش ، لە ناو لەپی دەستم دانیشتووە
بۆ خۆی کۆڵارە دەفڕێنێ
ئێستا ، هەموو دەمارە سڕبووەکانی
پێڵووی چاوم گەرم گەرمن
ڕۆشنایی مۆمەکانی پەنجەم ، هەموو بەیانیان

لەسەر کانی ماڵانی ڕۆحم
سەری تارماییەکان دەشۆن
لەمەودوا ئاگری سەر نینۆکی تاشەبەردەکان
لەژێر بارانی خەونی فریشتە بێگوناهەکان
دەکوژێنەوە
ئێستا ، شەو بەرگێکی سپی سپی لەبەردایە
من و شەو خوشک و براین
لەمەودوا شەو وەکو من
حەز لە خوێندنەوەی شیعر دەکا
ئەو کاتانەی
گوێ لە مۆسیقای ( مۆنامۆ ) ڕادەگرێ
تێر دەگرێ
لەمەودوا پێکەوە
لە شەوانی قەرەجیمان
شیعری قەرەجی دەنووسین و

ماچی قەرەجی لە یەکتری دەکەین و
گۆرانیە قەرەجیەکانمان بۆ یەکتری دەڵێینەوە
شەوەزەنگ مرد
شەو ناتوانێ جارێکی تر
لەسەر چوارپایەی تاریکی بخەوێ
وا ئێستا لەگەڵ
پێکەنینی ڕووبار و هەناسەی خۆرەتاو
بەزمی کەژاوە ڕێکدەخەن
شەوەزەنگ مرد ...
شەوەزەنگ سکی تاریکی لەبارچوو
شەوەزەنگ نەزۆکە نەزۆک ...!

**ئەیلوولی ١٩٩٥**

## چیرۆکە شیعری:

# (ڕەشبەڵەکی ڕۆح)

**یەکەم :**

لەگەڵ هاواری ژان و چریکاندنی ڕۆحی مێژووم
یەکەم بەهاری تەمەنم لە دایک بوو
کاتێک ، سوێسکە و پەپوولە و قەلەڕەشکە
دەستیان بە باڵەفڕکە کرد ، ڕووبار و جۆگەلە و کانی
دەمیان بۆ باران کردەوە ، ئەستێرە و مانگ ،
هەور و ئاسمان ، درەخت و گوڵ ، خوناو و سەراب
هەموو دەستیان بە سەماکرد
گوڵەگیان
تۆ لەم ساتە وەختەی پڕ لە نەشئە و پڕ لە

شاگەشکەی خۆشی و سەفا لە دایکبووی
ئەوکاتانەی چاوەکانت هەڵێنا
بەو دەستانەم
وێڵداشی منداڵدانی دایکتم لێت جیاکردەوە و
بە مەمکەکانم شیرم پێدای
چاوەکانم بۆت کردە بێشکە و پەنجەکانم کردە
دەسرازە و بە هەناسەم ڕامهەژەندی
گوڵەگیان
ئەو ساتەوەختەی لە دایکبووی
یەکەم کەس بووم پڕ بە دڵم ماچم کردی
دێتە بیرم ، پێشئەوەی گوڵی فیردەوسی
سەرلێوم بپشکوتن
پەنجەکانم بێ ئێسک بوون ، پشکۆکانی حەز و خۆزگەم
بە شنەبای پەرچەمی تۆ
باوەشێن نەدەکرا و

به قه‌تماغه‌ی خۆڵه‌مێشی شه‌وه‌زه‌نگ داپۆشرابوو
ئه‌وساته‌ی تۆش له دایکبووی
په‌نجه‌ره‌کانی چاوم نیوه لێڵ و نیوه ڕۆشن
به‌ڵام هێشتا
له‌گه‌ڵ له دایکبوونی تۆ . خوێنی ناو ده‌ماره‌کانی سه‌رم
ڕژێنه مردووه‌کانی تامه‌زرۆییم ، دووباره له‌دایکبوونه‌وه
له‌و ڕۆژه‌وه فێرت کردم
شان و ملم بده‌مه‌به‌ر ئه‌و په‌یامه‌ی له کۆڵمایه و
سواری پشتی بروسکه بم
گه‌رم گه‌رم
گۆرانی بۆ وه‌رزی هه‌رزانی بڵێم
له‌و ڕۆژه‌وه فێرت کردم ، سواری پشتی ئه‌سپی با بم
گه‌رم گه‌رم
ڕێوی ئاشووبی ئه‌م وه‌رزه ڕاو بکه‌م و سه‌ری ببڕم
له‌و ڕۆژه‌وه فێرت کردم

شیعر بکەم بە سەوزایی / بە ئەستێرە / بە گوڵ
بە نان / بە عەشق / بە پێکەنین و هەناسە
هۆ گوڵەگیان
کە تۆ هاتی ، چیتر خۆر لە قوڵایی دۆڵەکان و لە نێو
ئەشکەوت و گومبەزەکان ڕەشماڵی خۆی لێ هەڵنەدا و
چیتر شنەبای ئێواران
چاوی لە درەختی بەهاری ئومێدم سوور نەکردەوە
چیتر بەدوای ناسنامەی خۆمدا نەگەڕام
پێشتر دەنگ و ڕەنگم
هاوار و ژانم ، شیعر و گریانم ، بێ ناسنامە بوون
پێشتر نەمدەزانی
بۆ دەنووسم
بۆ دەگرییێم
بۆ دەژیم و بۆ دەشمرم
کە تۆ هاتی

لە یاسای ژیان و سروشت گەیشتم
کە تۆ هاتی
ژیژکی میراتگری چڵکی دەستی قوڕەیشییەکان
خۆیان گرمۆڵە کردەوە نەوەک
پەرچەمی شەکاوە سوورەکەی تۆ ببینن
عاشقانی ڕەوەز و داربەڕووەکانی چیاش
هەر خەریک بوون بە دەنووکە درێژەکانیان
گلێنەی چاوەکانم دەربهێنن
گوڵەکەی من
کە تۆ هاتی و لەگەڵ زەماوەندی
وەرزی ئەم لە دایکبوونەم
مێژووی سکی وەرزە خەمناکەکانی دوێنێم لە باربرد و
گوڵئەستێرەی شیعرێکی ناسکم
لە بەرۆک و سینگی خۆمدا
من ئەمڕۆکە

شاعیرە ڕەنگ هەڵبزرکاوەکەی دوێنێ نیم
ئێستا هاوارم
هاوار و ژانی ئەو بارانەیە
کە بۆ زیندووکردنەوەی ژیان لە دایک دەبێ
لەگەڵ ئەم هاوار و چریکاندنەم
من لە نێو بێشکەی دڵی ڕووبارێکی منداڵانە و هەرزەکاردا
شەپۆلێکی نامۆ و تەنیام
لە ناو کۆشی ئاسمانێکی شەرمناویش
گورزە بریسکەیەکی سەرشێتم
گوڵەکەی من
من دوێنێ خۆم نەدەناسی و لەم دەڤەرەش نابەلەد بووم
کاتێک سواری پشتی بروسکە دەبووم
لە بیابان خۆم دەدۆزییەوە و
گەرووم وشک و چاوەکانم پڕ زیخ دەبوون
کە سواری ئەسپی باش دەبووم
لە قەدپالی چیا و لە ناو ئەشکەوتە تاریکەکان
خۆم دەدۆزیەوە و
بە دەستەکانی خۆم
شەڕابی نامۆییم دەرخواردی خۆم دەدا
بۆ هەرلایەک دەڕۆیشتم
گۆمێکی پڕ لە قورەشین بوو
سەیری هەر ئەستێرەیەکم دەکرد
پارچەیەک ئاگر بوو بۆم
هەر کزەبایەکیش هەڵی دەکرد

سەری کاسمی دەڕووتاندەوە
بەڵام ئەی هەناسەکەم
کە تۆ هاتی و لەسەر سینگم چاوت هەڵێنا
من ئێستا
پەلەهەورە سەرلێشێواوەکانی دوێنێ نیم
من ئەمڕۆکە
گەر نۆبەرەی وەرزی ئەم لە دایکبوونەشم مێ بێ و
هەموو سکەکانی داهاتووشم مێ بن

هەست بە شەرمەزاری ناکەم
گوڵەکەی من
ژانی لە دایکبوون هەر یەک ژانە
چ مێ بێ چ نێر ...!
من هەموو پەنجەکانی خۆمم خۆشدەوێن
هەموو کۆرپە و گلێنەی چاوەکانی خۆم خۆشدەوێن
من هەموو دڵۆپە فرمێسک و دەمارەکانی خۆم خۆشدەوێن من
هەر چرپەیەک
هەر ئاخێک
هەر بزەیەک
هەر گەردێک
کە لە من لە دایکبوو بێ ، پڕ بە خوێنم خۆشمدەوێ
من ئەمرۆکە باڵام
بە قەد دووری ئەستێرەکانەوە بەرزە
خەڵک پۆڵ پۆڵ دێن بۆ دیدەنیم و تێر تێر بۆنم دەکەن

خەڵک پۆل پۆل دێن لە ژێر سێبەری دارسنەوبەری ڕۆحم
دەحەسێنەوە و دەبن بە گوڵ
لەگەڵ منا تێکەڵ دەبن ...!

هۆ گوڵەکەم
کە تۆ هاتی شوهرەتی من بە هەموو
کەلێن و قوژبنێکی ئەم وڵاتە بڵاوبۆوە
شەپۆلە شەڕانگێزەکانی تۆفان و هەوری چڵکن
کە سەیریان کردم من کێم و چین
کە گوێیان ڕاگرت چیم دەوێ
ئەژنۆکانیان یەکسەر دەستی بە لەرزین کرد
منیش ، بڵندتر گۆرانیەکانی خۆم گوتەوە
تا وایلێهات بنجە گیایەک نەما
گوێی لە گۆرانیەکانی من نەبێ
تا وایلێهات ئەستێرەیەک نەما ، سەربەکۆشی

خەونەکانم دا نەکات و لە گریان و پێکەنینم بەشدار نەبێ
گوڵەکەی من
دەپێمبڵێ ، چ مەخلوقاتێکی دڵ بەبرین ماوە
من نەناسێ و تۆ نەناسێ !
دەپێمبڵێ ، چ مەخلەقاتێکی دڵ بەبرین ماوە
شەیدای بۆن و بەرامەی بەهارەکەی ڕۆحمان نەبێ
ئێستا ،
ڕووانینی گرێشمەییم پڕ لە عەشقە و
لێوم کانی بزەی لێ دەردەبێ
ئەم بەهارە خۆشترە لە بەهارەکەی ساڵی پار
شەوان لێفەشڕەی جەخار بەخۆم دا نادەم و
لەسەر چوارپایەی مەراق ڕاناکشێم
ئێستا کۆتری خەون و هیوام
لە نێو هێلانەی خۆشەویستی بە گمەگمی بەیانیان و
ئێوارانی جەستەی پڕ لە برینم دەهێنێتە جۆش

ئێستا ئەستێرەکانی شەوە سوورەکانی ئەم وەرزەم
گۆرانی دەڵێن
کوکوختیەکانی هەناسەم زۆر دڵخۆشن
گوڵەکەی من
ئەو ساتە وەختەم قەت لە بیرناچێ ، کە هێمن هێمن
لە ناو بەهاری ڕۆحت پڕ بە ناخم دەتوامەوە

**دووەم :-**

ئێستا شەوە و
گڤەگڤی ڕەشەبا بەردەرگای ماڵی لێگرتووم
جارێکی تریش ڕەشەبا و
زریانی هار و شەپۆلی شێت و تۆفانی بە ترس
جارێکی تریش
هەتککردنی بسکی ئەستێرە و هەڵکۆڵینی

چاوی مانگ و خەتەنەکردنی زیندەوەرە مێینەکان
ئەمشەو کوورەی ئاشوبێکی تر دادەگیرسێن
ئەمشەو دەروێشە نەزۆکەکانی خۆشەویستی
شووشەی چرایەکان دەکرۆژن و بە نووکی شمشێرە تیژەکانیان
لەسەر دیوارە قوڕەکان دەنووسن
بژی ڕەشەبا
بژی ئافات
بژی ئاشوب
هاوارە لەم ژانەبرینە
هاوارە ئەمشەو درەختی مێژوو ژانی گرتووە و
هەناسە سوارە
ئەمشەو ماسیەکان لە ژێر ئاودا
دەسووتێن و
چاوی پەپوولەکانیش پڕ تیزاب دەکەن
هاوارە ،

ئەم وەرزە ، وەرزی کۆچ و خنکان و سووتانە
وەرزی هەڵکشانی با و وەرزی کوشتنی
گوڵاڵەسوورە و وەرزی زەماوەندی سێدارەیە
هاوارە لەم ژانە هاوارە
ئەمشە و تایفەی ( کلارا و ڕۆزاییەکان ) سەر دەبڕن و
( ماینەکەی نەژادیش ) * قۆڵبەست دەکەن
ئەمشەو ڤیستیڤالی پێناسەی مەرگ دەست پێدەکات و
چارەنووسی مێژوو بۆ بیست سەدەی تر دیاری دەکەن
هاوارە / ئەمشەو شەوی لە سێدارەدانی تریفەی مانگ و
شەوی خنکاندنی کازێوە و
شەوی پچڕاندنی وەتەرەکانی گیتاری شیعرە
ئەمشەو لە نێو سەمفۆنیای هاواری قاڕژنی بزنی مێژوو
دەروێشەکان هەیکەلی خوا ماچ دەکەن و
مەسیح لە خاچ دەدەنەوە

•ماینەکەی نەژاد : گەیشتن بە هیوا

ئاخ ئەم وەرزە ،
وەرزی لە دایکبوونەوەی « ملۆزمەی ئافات » و
وەرزی ڕەقبوونەوەی زەڕنەقووتە و
وەرزی ماچکردنی کێلی مردووەکانە
ئاخ ئەم وەرزە ئاخ ..!

گوڵەکەی من
ئەم وەرزە ، وەرزی قڕانی زیندەوەرە
وەرزی سەربڕینی گوڵەگەنم و قرچەقرچی سووتانی نانە
لەم وەرزی خنکان و سووتان و مردنەدا
دەپێم بڵێ گوڵەگیان ؟
بە کام بەستە و لاوک و حەیران دڵت خۆش دەبێتەوە ؟
گوڵەکەی من
کاتێک دەخنکێم و دەمدەن بە دەمی ڕووبارەوە
دڵتەنگ مەبە

من لە ناو پێشانگای خنکانیش دا
ئەو تابلۆیە زیندووەم نم نم وەکو باران
دادەبارێمەوە سەر پەڕەی لێوەکانت
من لە ناو خنکانیش دا
بە پەڕەکانی تۆ باسکەمەلە دەکەم و
لەسەر پەڕەکانی تۆش دەنووم و
خەونی خۆش خۆشیش دەبینم ...!
فڕین فڕین ، دەڕۆین لەناو خوێن دا گەوز دەدەین
ڕۆیشتن و کۆچ ، دەڕۆین لەسەرمانا ڕەق دەبینەوە
بستە خاکێک نەماوە نەبێتە ئارامگای زارۆکان
پەناگەیەک نەماوە ، لەژێر بارانی ترس شڕە خیوەتی
لێ هەڵنەدرابێ ...!
کۆچی ئەمجارەمان گوڵەسوورە و پەپوولەشی لەگەڵ خۆیدا هێناوە
فڕین فڕین ، فڕین بەرەو ئاسمانی بەفر و بەرە و وڵاتی بەفر و
بەرەو کیشوەرەکانی تاشەبەرد ...!

گوڵەکەی من ، تۆ لە کوێ بووی
من لە کاتی کۆچ و مردنم دا دەریاچەیەک فرمێسکم هەڵڕشت
خۆم بە غەریب هاتە بەرچاو
هێشتا ڕەشبەڵەکی لە دایکبوونم کۆتایی پێ نەهاتبوو
لە سەر پشتی کلۆبەفر دایاننام
تاکوو هەردوو پێ و هەموو جەستەم سڕ ببێ
چیتر نەتوانم گوڵە سوورەکەی خۆم ماچ بکەم
ئاخ ، دەنگم نووساوە و ڕۆحم تنۆک تنۆک خوێنی لێدێ

گوڵەگیان
ئێستا من غەریبم و تۆش غەریبی
هەروەک شەوی لە دایکبوونم لەم غەریبییەدا
بملاوێنەوە تاکوو منیش ڕاتهەژێنم
دەلەم غەریبییەدا
ماچم بکە ، تاکوو منیش

پڕ بە سییەکانم تێر تێر بۆنت بکەم
لەم شەوە تاریکستانەدا
لەسەر پشتی کلۆبەفر ، مانگ مۆڕەم لێدەکات و
تارمایی خیوەتەکانیش دەمترسێنن
گوڵەکەی من
لەم پێدەشتی غەریبیەدا من برسیمە
دە بۆم ببە بە لەتێک نان و تاکو منیش
تۆزێک تینم بێتەوە بەر
دە بەسینگی خۆتم بنووسێنەوە و فرمێسکەکانم بسترەوە و
من لە شەوانی کۆچ و مردن
لە سەفەرە دوورەکانم ، هەمیشە حەزدەکەم تۆم لەگەڵدا بێ
بۆ ئەوەی جار جارە لە ئامێزی گەرمت سەرخەوێ بشکێنم و پاشان
تێر تێر ماچت بکەم و ئازارەکانم برەوێنمەوە
ئاخ گوڵەگیان ...!
چەند غەریبم دە تۆش ماچم بکە

دە وەکوو پەپوولە شیلەی ناخم هەڵمژە
دە بم مژە ، مەمکەکانم ، سەری پەنجەکانم ، هەموو لەشم
دەی گوڵەگیان ، دە ئارەقەی ئەم غەریبییەم بلێسەوە و
بۆ ناو سیەکانت هەڵم مژە
دەی گوڵەگیان دەی . من لە کاتی سەرەمەرگیش
بە بینینت ڕاست دەبمەوە و دەست بە سەمای
عەشقم دەکەم / دەی گوڵەگیان
دە ماچم کە ، دەبم گوشە ، دەبم مژە
دەی گوڵەگیان ، دەی دەی دەی ...!
بۆن دێ
بۆنی لاشەی گەنیو ، بۆنی بارووت و بۆسۆ دێ
هەوای ئاسمانی ئەم وەرزە چەندە پیسە
هەوای نێو ئەشکەوتەکانی ئەم وەرزە چەندە پیسە
پیس پیس
پیستر لە ڕدێنە چڵکنەکەی دەروێشەکانی خوا

پیستر لە ڕشانەوەی بێغەمبەرەکانی خوا
پیس پیس پیس
زۆر دەترسم ، لە ناو ئەم ئەشکەوتە تاریکەدا
ئاوێنەی چاوی گوڵەسوورەکەم ببێتە سەراب و
ماچ و توانەوە و پێکەنینم ببێتە خەون
دەترسم جارێکی تریش زمانم بگیرێ و
ناوی خۆم بیر بچێتەوە
دەترسم ، دەترسم ، دەترسم
ئای ...! سەرابەکانی ئەم وەرزە چەندە لێڵن ...!
شەقامەکانی ئەم وەرزە چەندە لێژن
دەپێم بڵێ گوڵەکەی من
دەبێ دڵی ئەم وەرزە بۆگەنە چی تێدابێ چی ...!؟
ئاخ خخخخخخخخخخخخخخخخ !
نازانم کام دیمەنی ئەم ژائە برینەم پیشان بدەم
گەڕانەوە بۆ ناو سکی دایک و زەوی

یان گەڕانەوە بۆ ئامێزی مەرگ
خۆمەلاسدان لەناو ئەشکەوتەکانی وڵاتی بەرد
یان گرتنی لغاوی ماینی ڕێی هات و نەهات و
فڕین بەرە و ئاسمانێکی تر
گوڵەکەی من
ئەو ساتەوەختەشم قەت لە بیرناچێ
کە بە بەرچاوی خۆمەوە هەموو پەڕەکانت هەڵدەوەرین
کەوتنە نێو درزەکانی سکی زەوی
ئاخ چەند غەریبم گوڵەگیان
غەریبتر لە کچێنی کانی یە وشکەکان
غەریبتر لە هەڵوەرینی پەنجەی مێژوو
ئاخ گوڵەگیان
لەم غەریبی یەدا چاوەکانم هیچ نابینێ و
وەکو ئەو تەپۆڵکە و گردۆڵکانەی قەدپالی چیا بێدەنگم
وەکو ئەو چەمە پڕ لە بەرد و پڕ لە دڕکانەش بێدەنگم

وەکوو شەوێکی ترسنۆکی شەختەیی بێدەنگم
لەم تاریسکتانە پڕ نەعلەتییە
( تۆلستۆ ) م بێدەنگە
( دایە جۆنز ) م بێدەنگە
( لانگستۆن هیۆز ) م بێدەنگە
منیش بەبێدەنگی هەناسە دەدەم و خۆم دەکوژم
تا جارێکی تر و سەر لە نوێ
لە دایک ببمەوە و وەکو ئێستام نامۆ نەبم
ئێستا
ڕووباری نێوان مەمکەکانم
ئاوێکی شێلووی پێدا دەڕوات
ئێستا من لە ناو گێژاوی سەرگەردانی
هاژەی تاڤگەیەکی دڵتەنگم
دەی گوڵەگیان
دەستم دامێنت ئەمجارەش

ماچم بکە و بە سینگی خۆتم بنووسێنەوە
تاکوو ببمەوە بە پەپوولە و بە ئاسمانی دڵتا
بێم و بچم

دەی گوڵەگیان
دەوەرە لەسەر نینۆکەکانم
لەسەر پشتی هەردوو دەستم
لەسەر پەرەکانی لێوم ... بڕوێ
تا بە تۆوە بمناسنەوە و لەم غەریبی یەدا
ڕەنگی ڕۆیشتووم بێتەوەبەر
دەی گوڵەگیان
دە ماچم کە
دە بم گوشە
دە بۆنم کە
دەی گوڵەکەی خۆم دەی ...!

**سێ یەم :**

لە ناو مەملەکەتی کۆچ و مردن
لە ناو مەملەکەتی گوناه و تاوان
لەناو مەملەکەتی وشکبوونی ڕژینەکانم تامەزرۆیی
جارێکی تریش
چوونەوە خزمەت فیرعەون و
ماچکردنی ڕوومەتەکانی فیرعەون
هاوارە
دیسانەوە نوێژکردن لە ناو مزگەوتی گوناه و
کڕنووش بردنەوە بۆ فیرعەون ...!
جارێکی تریش ، ماچکردنی شەوەزەنگ
لە ملکردنی گەردانەی شەرم
جارێکی تریش ، چوونەوە ناو قۆزاخەی بێ ئومێدی
هاوارە دیسانەوە
شەو بەسەر بردن لە ژێر خیوەتی پڕ گوناهی

فیرعەونییەکان
دیسانەوە پاڵکەوتن
لەژێر سێبەری داری پڕ کرمی فیرعەونییەکان
هاوارە گوڵەکەی من
من لە خەمی خۆم و لە خەمی تۆ و لە خەمی هەموو
ئەو درەختانەم کە لە نێو دڵی بەهار لە دایک دەبن
ئەم دۆزەخە لە سەر سینگی مەرگ لە دایک بووە
ئەم دۆزەخە مارشی خوێن مژینم بۆ دەڵێ
ئەم دۆزەخە
بنی پێیەکانم داغ دەکات و برژانگەکانیشم دەسووتێنێ
ئەم دۆزەخە وەرزی لە دایکبوونەوەی
زرە پێکەنینی فیرعەونە
وەرزی لەدایکبوونەوەی
تارمایی ڕەشی چاوەکانی فیرعەونە
بەڵام گوڵەکەم

ڕێبوارانی هەڵوەدای عەشقت
لەم دۆزەخەش لە هەناسەدان نەکەوتوون
ڕۆژ دێ و دەڕوا ، وەرز دێ و دەڕوا ، کۆچ دێ و دەڕوا
مردن و لە دایکبوونەوە
لە دایکبوونەوە و هەناسەدان
هەناسەدان و پێگرتن
پێگرتن و گەورەبوون
گەورەبوون و گەورەبوون
باران ، گوڵ ، نان ، گۆرانی ، سەما
بێ ئومێد مەبە ، گوڵە گیان ، بێ ئومێد مەبە
ئێستا هەڵوەدا و دڵدارانت
بەبۆن و ڕەنگی تۆوە هەناسە دەدەن
گوڵەکەی من
هەرچەندە
ئەم دۆزەخە وەرزی لە دایکبوونەوەی تۆ نەبوو

بەڵام ،
ئێستا تۆ خۆشترین ئاوازی گۆرانییەکانی مێژووی
بووی بە یەکەم تاقیگەی ژیانەوەو لە دایکبوونی
ئەم مەملەکەتە
بووی بە یەکەم ، تاقیگە
بۆ دیاریکردنی ڤایرۆسەکانی وەرزی گرانی
بێ ئومێد مەبە گوڵەگیان بێ ئومێد مەبە
لە ناو دڵە ڕاوکێ و هەناسەدانی بە ترس
ڕۆیشتن بەسەر ئاگردانی پڕ لە پشکۆی ئاگر
دووبارە ڕیگاوبانەکان بزمارڕێژ کرانەوە
دووبارە ئاوی گومانەکان شەختەیان کردەوە
باڵندەکان ، ئەمجارە کۆچیان کرد و نەگەڕانەوە
لە ناو وەرزی شەختەو وەرزی نێوچاوان مۆرکردن
سییەکانم بە سێ بۆڕی هەناسە دەدەن
هەر یەکێک لە چاوەکانم سێ برژانگی هەیە

هەر یەکێک لە مەمکەکانم سێ گۆی هەیە
ئێستا من سێ کەسم
کۆرسی سروودەکەشم سێ ڕیزە
ناو دەمیشم سێ زمانی تێدایە

ئاخ گوڵەگیان
دەزانم ئێستا تۆش هەست بە ئازارەکانی من دەکەیت و
دڵنیام تۆش وەکو من دەڵێی
دەبێ کەی بێ ؟
سییەکانم بە یەک بۆڕی هەناسە بدەن
هەر یەکێک لە چاوەکانم یەک برژانگی هەبێت
من یەک کەس بم
ناو دەمیشم یەک زمانی تێدابێ و
کۆرسی سروودەکەشم یەک ڕیز بێت

ئاخ گوڵەکەی من
دەبێ کەی بێ ؟
دەبێ کەی دەبێ کەی ...؟!
لە ناو مەملەکەتی بێ ئاسمان و بێ پەلکەزێڕینە و
بێ هەور
دەبێ ببم با ئاسمان و ببم بە مانگ و بە ئەستێرە
دەبێ ببم بە هەناسەی درەخت و بە پێکەنینی ماسی
دەبێ ببم بە بێشکە و بە ئاوێنە و سەراب
گوڵەکەی خۆم
من چۆن دەتوانم ببم بە گۆرانیەکانی
ڕۆحی پەلکەزیرینە
کاتێک ڕقم لە چاویلکەکانی خۆم بێتەوە
من چۆن دەتوانم
لەم شەڕە خۆم دەرباز بکەم
گەر بە شمشێری دارەوە بچمە شەڕ

چۆن دەتوانم
دەمامکە ڕەنگاوڕەنگەکان
پچڕپچڕ بکەم گەر دەستەکانم بێ پەنجە بن
ئای گوڵەگیان
ئەوە منم وەکو سیحربازەکان و دەروێشە
زیکرکارەکان
درۆدەکەم و لەسەر بەرماڵی خەون ڕاکشاوم
ئای گوڵەگیان !
ئەم وەرزە وەرزی چنینی دەمامک و
وەرزی دابەشکردنی دەمامکە
دەمامکی ڕەنگاوڕەنگ و دەستەسڕی ڕەنگاوڕەنگ
پشتێنی ڕەنگاوڕەنگ و پارچە پەڕۆی ڕەنگاوڕەنگ
دیواری ڕەنگاوڕەنگ و قوتابخانەی ڕەنگاوڕەنگ
مامۆستای ڕەنگاوڕەنگ و پێغەمبەری ڕەنگاوڕەنگ
خوای ڕەنگاورەنگ و ئاسمان و دنیای رەنگاورەنگ ...!

گوڵەکەی من
دەپێم بڵێ .. چۆن شەپۆلی ڕەنگێک لووڵمان نادات
گەر کەشتیەکەی نوحمان نەبێت ؟!
لە ناو مەملەکەتی درۆ و تاوان و دەمامکدا
دەمامک چنینەکان قەڵایەکی تازەیان
دروست کردووە
ئێستا گۆرانیەکانی ئەم دۆزەخە لەگەڵ
خەونە ڕەنگاورەنگەکان تێکەڵ بەیەک بوونە و
ئاوازێکی بێ سۆز و بێ گیان دەڵێنەوە
ئێستا چوونە ناو ئامێزی یەکتری شەوانەمان
وەکوجاران گەرمم ناکاتەوە
ئای گوڵەگیان
لەم مەلەکەتەدا
ئێستا ، گوڵی دۆزەخی بۆن دەکەن
دەمامکی دۆزەخی لەسەر دەکەن و
دەسرۆکەی دۆزەخیش بادەدەن !

گوڵەکەی من
بۆ ئەوەی زیاتر لەبەر گڕی ئەم گەرمایە
سەرم نەڕووتێتەوە
چیتر شەڕ لەگەڵ خۆمدا ناکەم
ئێسکی پەراسووەکانی خۆم ناکرۆژم
چیتر دڕک لە پێیەکانی خۆم ڕاناکەم و
ئاوی چاوەکانی خۆم نارژێنم ..!
چیتر چاوم بەرایی نادات سەیری پەنجە
سڕبووەکانی خۆم بکەم
من دەمەوێت خۆم بکوژم
تاکوو جارێکی تر لە دایک ببمەوە و
پەنجەکانم گەرم گەرم بن ...!
گوڵەگیان
ڕێگام دوورە بەم هاوینەش واخەریکە
لە تێنوواندا دەخنکێم

ئەو شەوانە بێزارم دەکەن
کە نەمتوانی
شیعرە ناسکەکانی دیوانی چاوت بخوێنمەوە
ئەو شەوانە ئازارم دەدەن
کە نەمتوانی
تەنها نامەیەکت بۆ بنووسم
من ناتوانم ، هەمیشە بە دیار دارسێوە نەخۆشەکانی
چاوی خۆم بگریم
من ناتوانم ، هەمیشە لە چاوەڕوانی گۆدۆیەک دا بم
بێ گوڵ و بێ شیعر بژیم
گوڵەکەی خۆم
بۆ ئەوەی لە شەوە شەختەییەکان ڕزگارم بێ
بۆ ئەوەی جارێکی تر
بە منداڵی گۆرانیەکانی پیری نەڵێمەوە
بڕیارم دا

هەرسێ زمانەکانی ناو دەمم بکەم بەیەک
هەر سێ مەتارەکانی ئاوم بکەم بەیەک
منیش ،
مۆمی لە دایکبوونەوەم هەڵبکەم
منیش ببم بە ڕووبارێک
گێلکەگانی چواردەوری خۆم ئاو بدەم
گوڵەکەی من دەبم بینە
هەتاکەی دەستت لە ئەژنۆکانت نابێتەوە
دەبم بینە
خۆ ئێستاکە
لە تۆ زیاتر
هیچ گوڵێکی ترم خۆش ناوێت
تەنانەت لەگەل خوداش دا ناچمە ژووان و
چیتر لە گەڵیدا جووت نابم
دەبم بینە

بەم تەمموزە وا زەماوەندی لە دایکبوونم دەگێڕدرێ
دڵتەنگ مەبە گوڵەکەی من
تا هەناسەدانی زیندەوەرەکان و
هەناسەدانی گژوگیا مابێ
من و تۆش ...
هەمیشە هەر لە دایک دەبینەوە
گوڵەکەی من
من بە تەنها لە چاوەڕوانی تۆ دام
تەنها بە تۆ دڵم بەختیار دەبێ
ئێستا
شیعر بۆ لە دایکبوونەوەی تۆ دەنووسم
چاوەڕێمە تۆش کۆشێک سێوی شیرینم بۆ بێنی
چاوەڕێمە ، چاوەڕێمە چاوەڕێ
گوڵەکەی من
من لە پێناو لە دایکبوونەوەی تۆ دەژیم و

دڵنیاشم کەس وەکوو من تۆ ناناسێ و
کەسیش وەکوو من
تۆی خۆش ناوێ نا ...!

**چوارەم :-**

عەشق لە ناو قۆزاخەی سڕبوون ، بێ بەهایە
بارانێک بۆ گوڵ نەبارێت مردنە
بە قەد دوو تەمەنی کۆرپەڵەییم
لە ناو قۆزاخەی سڕبووندا بووم ...!
بە قەد دوو تەمەنی کۆرپەڵەییم دەڵەمەبووم
ئاخ ...!
چ ئازارێکە هەناسەی درێژی گەریدەییم ؟!
من لە هەمووتان ڕاستگۆ ترم
بۆیە پەنجەکانم خوێنیان لێ دێ و

مەلۆتکەی عەشقی سپیم ژاندەیگرێ
عەشقم بێگوناهە
عەشق نەبووایە من خۆم نەدەناسی
گوڵەکەی من
من خۆشەویسترین درەختی عەشق و
سەوزترین بەهاری عەشقم
قەت بیرم ناچێ
لە ناو زامەکانی عەشق و سەفەری عەشق
لە ناو گریانی عەشق و مردنی عەشق
چوار وەرزی تەمەن و
چوار بەهاری ڕۆحم تێپەڕین
گوڵەگیان
ئێستا من گەنج بوومەتەوە و عاشقێکی شۆخ و شەنگم
دەمەوێ بە ناو کۆڵانە پێچاوپێچەکانی ڕۆحی عەشق شۆڕ ببمەوە
دەمەوێ لەناو ئەزموونەکانی عەشق فەیلەسوفێکی ڕیش سپی بم

بە عەشقم
سەرلە نوێ ژیان دروست بکەمەوە
من شاعیرێکی عاشقم
دەمەوێ کوکوختیە پیرەکان وەکو خۆم گەنج بکەمەوەو
دەرسی عەشقیان پێ بڵێم
دەمەوێ گوێم لە چرپەی گریان نەبێ و
ماسییە دڵخۆشەکان لە سەمای خۆیان نەکەون
گوڵەکەی خۆم
ئێستا وەرزی پیربوونم تێپەڕیوە ، سینگم گێلگەیەکی تەڕە
ئێستا دەتوانم بالۆنەکانی تۆفان و
بالۆنەکانی بوومەلەرزە و بالۆنەکانی ڕەشەبا
کون کون بکەم
من پەیامی لە دایکبوونەوەی حەقیقەتم
سروشت بە سییەکانم هەناسە دەدات
من لە هەموو ئەستێرەکان بڵندترم

ئای گوڵەگیان چەند دڵخۆشم ئای
گوڵەکەی خۆم
لەسەر لێوی پێدەشتەکانی ئەم وەرزە
لەو ڕۆژەوەی ڕەشەبا چنگی لە گەردنی
گوڵەگەنم گیرکردووە
گوڵەگەنم ڕۆیشتووە نەگەڕاوەتەوە
پرسیار پرسیار پرسیار
ئێستا هەموو زیندەوەرەکان چاوەڕێی
گوڵەگەنم دەکەن
ئێستا هەموو هێندە غەریبی گوڵەگەنم دەکەن
تا لە غەریبی و چاوەڕوانی دا شەکەت کەوتوون
ئەم دەڤەرە بێ گوڵەگەنم غەریبە
من دەمەوێ ، بە هەناسەم بژیێمەوە و
کاسەی چاوەروانی و غەریبیتان بشکێنم
وەرن لەگەل مندا سەما بکەن

لە ناو لەپی دەستی من گوڵەسوور چاوی هەڵێناوەتەوە و
وا گۆرانیتان بۆ دەڵێ
دە گوێ ڕاگرن
دە باوەشێنەکانتان بە دەستەوە بگرن
پشکۆی چاوە گەشەکەی ئەم گوڵەسوورەی من
باوەشێن بکەن و
خۆڵەمێشی غەریبیش بکەن بە دەمی دەریاوە
ئۆخەی گوڵەگیان
وا لە ناو دۆزەخی مردن و مەملەکەتی برسیەتی
ڕەشبەڵەکی لە دایکبوونەوەی تۆ و
ڕەشبەڵەکی مارەبڕینی دایک و باوکمە وا دەنگی دێ
ئۆخەی گوڵە گیان ئۆخەی !
وا لەناو دۆزەخی گومان و مەملەکەتی دەمامک دا
ڕەشبەڵەکی خۆرەتاوی ڕۆحی منە
ڕەشبەڵەکی گوڵەسوورەی ڕۆحی منە

ڕەشبەڵەکی لە دایکبوونەوە و هەستانەوەی ڕۆحی منە
وا دەنگی دێ
ئۆخەی گوڵەگیان ئۆخەی
ڕەشبەڵەکە ڕەشبەڵەکە ڕەشبەڵەک ...!

**کۆتایی ئایاری ١٩٩٥**

**سەرەتایەک بۆ خەمە سپییەکانمان :**

- عەشق و بەرائەتی ئاو پێشکەشە بە ....
ئەوانەی لە ماڵەکانیان گۆرانی عەشق دەڵێن
ماڵەکانیان پڕاوپڕە لە بەختەوەری
ئەوانەی بەرەو هەوارگەیەک دەڕۆن کە مرۆڤەکان لەوێندەرێ
بە ڕەهایی سەما دەکەن و گۆرانی دەڵێن و پێدەکەنن
ئەوانەی لە کۆشکە شووشەبەندە چراخانییەکانی عەشق
سۆزانیترین خەونە ڕووبارییەکانیان سەبەتەیەکە لە تریفە
ماندووترن لە باران
باڵا زراڤیتر و شەنگەبیتر و سنەوبەریترن لە مەرگ ...!

**ناڵە حەسەن**

# شەباهەنگی بەفر

بە گیانی ئاونگیت سوێند دەخۆم
ئەی خەنەبەندانی فیردەوسی ڕۆحم
کە تەمەنی کچێنی بارانە نەباریوەکانم
بیر نەچێتەوە ...!
بە سەبکی باڵای ڤینۆسیت سوێند دەخۆم
ئەی جاویدانتر لە گزنگی سەحەر
کە شەوی پەردەی پەپوولە و ئەستێرەکانم
بیر نەچیتەوە ...!
لە بیرمایە لە یەکەم شەوی تەمەنم دا
مۆمم لەناو لەپی دەستەکانی خۆم داگیرساند
ئەم شەویش بە شەڕابی فرمێسکەکانی ئەم مۆمە
خۆم مەست دەکەم و یەخەی قەدەر دەگرم

بۆ تەنها ساتێک ژاوەژاوی ئەم زەمەنە سەرشێتە جێدەهێڵم
لێمگەڕێ :
با لە پەنجەرەی چاوەکانت بێمە ژووری
دەمەوێ
لەگەڵ فرمێسک و هاواری شیعر لە دایک ببم
دەمەوێ ، لەگەڵ ئاخی گوڵە نێرگزییەکانی
سەفەر کردووی بەختت گەورە ببم
سڵاو ئەی عەشق
سڵاو ئەی جاویدانتر لە فیردەوسی با
سڵاو ئەی خەونە زڕاوەکانی ڕۆژگارە
وەجاغکوێرەکان ..!
ئەمشەو
سەرقافلەی تریفەی مانگ دڵی پرە
گەلا دۆزەخییەکانی تارماییە رەشەکان
ڕێگاکانی بەهەشتیان داپۆشیوە

ئەمشەو ..
هەردوو مەمکی تەمەنی کچێنی عەشق
بەسەر شانم شۆڕبونەتەوە
لە قوولایی دڵە خەمناکەکانیان
تف لە ئاوێزانبوونی هەوری ئافات و
خەونە کابووسییەکانی قەدەر دەکەن
ئەمشەو ..
چیرۆکە پەنهانییەکانی عەشقە ئەبەدییەکان
بوخچەی گرێدراوی شەهوەتیان دەکەنەوە و
کێڵگەی مێژووە نەفرەتکراوە وشکهەڵاتووەکان
ئاوپژێن دەکەن
ئەمشەو ..
تریفەی مانگ و گوڵبارانی هەور و هەناسەی با
بەیەکەوە پیاسەیەک بە شەقامەکانی نامۆییمدا دەکەن
سڵاو ئەی گوڵە بەفرینییەکانی فیردەوسی ڕۆحم

سڵاو ئەی گۆرانییە بەسۆزەکەی لاشەی بریندار  
بەرباران عەشق  
سڵاو ئەی شەباهەنگی نێو مەمکۆڵەی بەفر  
خۆم دەخزێنمە نێو باوەشی هەڵمی ڕووبارە شەرمنەکان  
لەگەڵ کازێوەی عەشق پێکەوە سەفەر دەکەین  
دەمەوێ لە ئاهەنگی لە دایکبوونی خۆر سەما بکەم  
تا لە بەهەشتی خەونە سک پڕەکانی بەهار  
دەسکە گوڵێک بۆ تەمەنی کچێنی خۆم و بۆ گەڵا پایزییەکانی  
ئەم دەڤەرە بە دیاری بهێنم  
ئای کە ئارەزوومە  
شەوێک بە چاوەکانی خۆم ببینم  
مردنی وەرزەکانی بەفر و غەریزە سڕبووەکانی درەخت  
ئاوێزانی یەکتری بن  
ئەوسا پڕ بە دڵم

بۆ شەوە سوورەکانی مەملەکەتی خۆر گۆرانی دەڵێم
لەگەڵ پوشکوتنی گەڵا بەهەشتییەکانی عەشق
شیعر دەخوێنمەوە و
لەگەڵ بەستەی شەوبەراتی ئەویندارە فیردەوسییەکانیش
زیکر دەکەم
سڵاو ئەی شنەبای نێو هەناسەی پەلکەزێڕینەی
ئێوارانی عەشق
سڵاو ئەی فرمێسکە بێگەردەکەی گۆنا شووشەییەکانی با
سڵاو ئەی خۆزگە سنەوبەرییەکانی سەرسینگی پەپوولە
تازییەدارەکانی بەهەشت
ئەمشەو دەڕۆم ..
لەگەڵ خەونەکانی گوڵەگەنم سەفەر دەکەم
تا ناونیشانێک بۆ شیعرە ئەفسووناوییەکانم نەدۆزمە
نایێمەوە
ئەمشەو دەڕۆم ..

لەگەڵ میزاجی ڕۆحی ئەستێرەی کاروانکوژە و
بریسکەی پرچە بەفرینیەکانی دایکم سەفەر دەکەم
تا لە ئەفراندنی گۆرانییە خۆڵەمێشییەکانی کچێنی لافاو
تێنەگەم نایێمەوە ...!
ئەمشەو دەڕۆم ..
دەبمە شۆڕەسواری سەفەر
دەبمە شۆڕەسواری خەونە پەمەییەکانی کچان
دەبمە شۆڕەسواری عەشق
دەبمە شۆڕەسواری شەباهەنگی نێو مەمکی بەفر و
شۆڕەسواری جاویدانی فیردەوسی ڕۆح ...!

**ئازاری ١٩٩٦**

# سەمای لە دایکبوونێکی تر

ئەی ئەوانەی
بۆ ناشتنی بزەی سەحەری خەونەکانم چاوەڕێنە
ئێوە لە نێو دوورگەی قڵێشاوی لەپی دەستم لە دایکبوون
دەزانم ،
دڵی هەمبانەی خۆزگەکانتان لێم بە قینە
سیمای دڕندانەی سەرمایەتان گرژ و ڕەشە
دیتە بەرگوێم
هەموو شەوێ بە چرپەوە باسم دەکەن
بەسەرهاتم بۆ یەکتری دەگێڕنەوە
دەتانەوێ پەڕەمووچەی باڵەکانی کۆتری هیوام
دەربهێنن

چیتر شەوان چاولێک نانێم نەبادا بێن
ساڵنامەی مانگەشەوی تەمەنم ئاوەژووکەن
هەردوو دەست و مەمکی هەورە بەهارییەکانم ببڕنەوە
من قوتماغەی زامی سەختی دڵی مێژووم
لەگەڵ یەکەم چرپەی گریان لە دایک بووم
من ژیلەمۆ و چرپەی لێوی وەرزەکانم
تادێ ڕەنگم گەشتر دەبێ
تادێ ، لە نێو منداڵدانی شەوە تاریکەکان
سۆماو نیگای چاوەکانم تیژتر دەبێ
من بارانم گۆنای گژوگیا تەڕ دەکەم
تیشکی خۆرم
گڕ لە هەڵمی سەر دەریای ناخم بەردەدەم
من پاڵەوانی ڕۆمانێکی بێ کۆتاییم
هەناسەم خوێنی گەرمی دڵی مۆمیاکراوی
چرایەکی کوژراوە ...

من شەوانان
گوی لە ئاوازی لەرینەوەی گەڵا وەریوەکانی ڕۆحم دەگرم
چیتر شەوانان چاو لێکنانێم ، نەبادا بێن
دەفتەری یادگاری تەمەنم بسووتێنن
ئێستاش ، خۆم و بوخچە نەکراوەکانی هیواکانم
خۆم و گۆچانە درێژەکەی دەستم
لەسەر گردی ئەو تابلۆیە ڕەشەم
کە بەدیواری پیشانگاکەی دڵی مێژوو هەڵواسراوە
من گۆرانییەکی پڕ لە عیشقی مەمکی گوڵم
لەو ڕۆژەوەی خۆم ناسیوە
لە ناو ئاوێنە و سەرابی ڕۆحی مندا
سەمای لە دایکبوونێکی نوێ و
مۆسیقایەکی تەڕ و
خۆرەتاوی دنیایەکی تر دەبیندرێ ...!

**بەفرانباری ١٩٩٤**

# بەهەشتی سەراب

ئەستەمە لەبیرکردنی ساتە چاوەڕوانکراوەکانی
فریشتە خەمناکەکان
لەبیرکردنی شەوانی تەنیایی شەنگەبییەکی ڕۆح سووک
لەبیرکردنی ئەوساتەی
دەستم خستە بن سەری هەور و نیگای گەرمی مانگم خوێندەوە
نەمردم شەوێک لە شەوانی تەمەنم
لە کاروانسەرای غەریبان و بێ داڵدایان
لە شەوە تاریکەکانی مەملەکەتی شەمشەمەکوێرە و غوربەت دا
بە دیار ئاگردانی بزەی ڕۆح سەلەفیەتی مێژووم نووسییەوە
ئەو خەونە شیرینانەی لەم شەوانەدا دەمبینی
هەمووجار بۆ ئەو ڕووناکیە چوارگۆشەییەی
کە دەمەو ئێواران دەبوو بە میوانی دڵم دەمگێڕایەوە

شەوانان ئەو پەڕەسێلکە بێ پەڕ وبالانەم لە باوەش دەگرت
کە لە کەنار دەریای نامۆیی و
لە ناو قۆزاخەی تەمتوومان سەرشێتی دا خۆیان ون کرد بوو
ئەو دەمانەی کەڤاڵی هونەرمەندێکی عاشق دەبینن
توورە مەبن
سواری سەر شەپۆلی رەنگەکانی بن
هەموو لقی درەختێک ڕەهایە کاتێک کرنووش بۆ ئاو دەبات و
تینوێتی ڕەگی شەهوەتیان بە یەکتر تێر دەکەن
ئەو کورە شەرمنانەی شەوانان بێ نوێژ دەبن گوناهن
هەمیشە خەون بەو دەستە نەرمۆکانەوە دەبینن
کە لێیانەوە فێری عەشق بوون
دەخیلتم ئەی عەشق
دەخیلتم ئەی بەرائەتی پێکەنینە کۆرپەڵەییەکانی
نێو منداڵدانی ڕوخسارە نامۆییەکان
فریام کەوە ئەی عەشق

من بە دوای خەونەکانی ئاو دا دەگەڕێم
دە فریام کەوە فریا ..
با ژوورە تاریک و خامۆشەکان ڕووناک بکەینەوە ، ئەی عەشق
دەفتەری بیرەوەری موسافیرەکانی ئەو وێستگەیە
بخوێننەوە
تا لە بێهوودەیی نێو خەڵوەتی دەروێشانە و لە ئەبەدییەتی
توانەوەی ڕۆحتان تێ بگەن
وەی گیان ، ئەی پەپوولە ڕەنگاوڕەنگەکانی نێو گوڵزاری بەردیدەم
وەی گیان ، ئەی نم نمە بارانی مەمک فەریکەیی
وەی گیان ، ئەی کۆتر سپییەکانی دەمەو نیوەڕۆیان یاریتان
بە ئەلقەی پەنجەم دەکرد
وەی گیان ، ئەی منداڵە وێڵەکانی سەر شەقامەکانی گەردەلوول
وەی گیان ، ئەی هەناسەی خۆری شەبەقی بەیانی
وەی گیان ، ئەی مردووەکانی نێو گۆڕستانی بەهەشتی سەراب ، وەی گیان ...!

**بەفرانباری ١٩٩٦**

# کەرنەڤاڵی لە دایک بوون

گوڵ لێرەیە ، لێرە سەما بکە
کارل مارکس
سەما بکەن
کەرنەڤاڵی لە دایکبوونمە
گوڵ لێرەیە ، هەر لێرەش پشکۆکان دەگەشێنەوە
ئێرە هەوارگەی خەنەبەندانی ئەوینە
دەگوێ ڕاگرن لە گۆرانییەکانی درەخت و لە پێکەنینی شنەی با
دەگوێ ڕاگرن لە سەمفۆنیای ئاونگە سپیدەییەکان و
لە مۆنامۆترین مۆنامۆی خۆشەویستی
کەرنەڤاڵە ، کەرنەڤاڵە ، کەرنەڤاڵ
کەرنەڤاڵی لە دایکبوونی خۆرەتاو و ئەستێرەیە
کەرنەڤەڵی لە دایکبوونی شەپۆلەکانی دەریا و

سەمای گوڵە وەنەوشەیە
کەرنەڤاڵی لە دایکبوونمە
دە سەما بکەن ، دەی سەما بکەن ، سەما بکەن سەما
من هاتووم
تارماییە لێڵەکانی بەرچاوتان لابەرم
هاتووم ، کابووسی نیو خەوی شەوە یەڵداییەکانتان ڕاوبنێم و
شەمشەمەکوێرەکانی تاریکیش سەرببڕم
مێژووم شاهیدە مێژوو
بەبەرچاوی ڕۆشنەوە هاتووم و بەرەو دنیایەکی باشتر دەڕۆم
تەنیا منم لەوەتەی لەدایک بووم
پەرچەمی یەکسانیخوازیم دەبریسکێتەوە
تەنیا منم لەوەتەی هەم لەگەڵ شەوەزەنگ دەجەنگم
خۆرەتاویش لەناو لەپی دەستەکانم گەش ڕادەگرم
تەنیا منم بە تەنیا من
لەوەتەی هەم ئەو شەپۆلەم

کە گۆرانییەکانی
دوێنێ و ئەمڕۆ و سبەم یەک ئاوازە
سەربەرزانە هەموو ڕۆژێک هەر دەیڵێم و دەیڵێمەوە
تەنیا منم لەوەتەی هەم پەناگەی ئەویندارانی بێ نەوایانم
لەبەردەم ڕەشەبای ئافاتە فیرعەونییەکان
کڕنووش نابەم و دەروازەی جێڕاوگەی ئەوینی و
سەما ڕەهاییە ئەبەدییەکانتان بە ڕوو داناخەم
تەنیا منم ، گرمە گرمی هەورە ڕەشەکان و
بروسکە سەرشێتەکانی ئاسمانی شەڕ ڕیسوا دەکەم
کاتێک کە شەوانان لەنێو ماڵ و حاڵی خۆتان لە خەوی شیرین
ڕاتان دەپەڕێنێ ...!
تەنیا منم بە تەنیا من ،
لەسەر لێوی خەونەکانی منداڵە بێنازەکان چرۆ دەکەم و لە ئامێزی
خولیا و ئومێدی مرۆڤە ماندووەکانی خێلی کاریش گەورە دەبم
گوڵ لێرەیە ، دە هەر لێرەش سەما بکەن

ئاخر کەرنەڤاڵی لە دایکبووغە
دە سەما بکەن ، دەی دە سەما بکەن ، سەما بکەن سەما
هۆ ژنانی لووت بڕاو ، قژ سووتاوەکانی بێ گوناه
هۆ کچۆڵە عاشقەکانی لێو بەخەم
هۆ منداڵە دەست فرۆشەکانی سەر شۆستەی گەردەلوول
هۆ پیاوانی سەرگەردان و شێواوەکانی نێو دۆزەخی یەڵدایی
ئەی ئەوانەی ،
تەمەنیکە لەگەڵ سفرەی خالیتان رەنگی یەکترتان گرتووە
ئەی کۆیلەکان
هەر هەمووتان دەپێم بڵێن
( کێ ڕزگارتان دەکات جگە لەوانەی وەک خۆتانن )
ئەوەتانێ ئەوە لەپی دەستەکانم
بە بناری دەمارەکانی ناخم هەڵگەڕین
بەناو خوێنی دەریای عەشقم بتوێنەوە
با پێکەوە ، بەرەو بەهەشتی خۆشەویستی و

بەرەو دنیایەکی باشتر بڕۆین
دەوەرن لە تەکما ڕێبکەن
با پێکەوە ، پۆل پۆل گۆرانی بۆ گوڵەگەنم و
بۆ خۆرەتاوی ئەڤین بڵێین
ئەی کۆیلەکان
هەر هەمووتان
دەوەرن دەی کەژاوەکەم گەورەتر کەن
گوڵ لێرەیە ، هەر لێرەش پشکۆکان دەگەشێنەوە
دە سەما بکەن ، ئاخر کەرنەڤالی لە دایک بوونمە
دە سەما بکەن ، دەی دە سەما بکەن ، سەما بکەن سەما ... !

**حوزەیرانی ١٩٩٧**

# سەمفۆنیای گوڵ و نان

باڵندەکان ، لە ئامێزی مانگ ڕاکشاون
سەریان لە خەنەی با گرتووە
بە دوای پێستی مارمێلکەکان دا دەگەڕێن
پێڵووی چاوی تەرمەکان هەڵدەدەنەوە و
سەمایەکی بێ گۆرانییان لە پێش دەکەن
ئێرە گۆڕەپانی شۆڕەسوارانی غارغارێنە
گەنم لە گۆڕستانی ژێر سینگمان دەنێژرێ
پەلکە زێڕینە ،
بە حەیرانی تاڤگە و خۆرەتاو دەخەوێ
کارێزەکان بە لەنجەوە چاو هەڵدێنن
باران ، پرسەی ماتەمینی باخ و کێڵگەکان دەگێڕێ

لەم ئۆقیانووسە هەناسە سوارەدا
ڕەگی چاومان لەژێر کەپری بەر سێبەری باڵامان
لەدایکبووە
ئێستاش لەسەر پشتی هەور سەما دەکا
ئاگری سەر تەپۆلکەی ئەژنۆکانمان گەش دەبێتەوە
کێ دەڵێ ... هەر ئەمشەو تەرمەکان زیندوو نابنەوە..؟
زەماوەندی خۆرەتاو ناگێڕن ...!
ئەو شەقامەی لە بەفر دروست کرابوو
وا خەریکە
هێدی هێدی دەتوێتەوە
تارماییەکان بەرەو چیا هەڵدەکشێن
داربەڕوو دەست بە گێڕانەوەی چیرۆکی بەر ئاگردانی
شەوانەی دەکاتەوە
لەبن مەمکی ئەم سپیدەیە ، درەختەکان پێدەکەنن
کانییەکان گۆرانی دەڵێن

داسەکان خۆیان تیژ دەکەنەوە
تەونکارەکان ، دەسترازەی نوێ دروست دەکەن
پەپوولەکان ، عاشقانە دەم دەخەنە نێو دەمی یەکتری
کەمانجە ژەنەکانیش
بۆ سەمای فریشتەیی
سەمفۆنیای گوڵ و نان دەژەنن ...!

**ئابی ١٩٩٤**

# سەفەری ڕەهابوونی خەون

**-لەدایک بوون**

ڕۆحی پاکیزەییم
دەسگیرانی فریشتە سپییەکان بوو
ئێستا تاڵاوی مەرگ دەچێژێ
ڕۆژگارە سەفەرییە گۆبەندییەکان
شەرم لە شیعرە وەنەوشەییەکان دەکەن
کاتێک لەشکری مردووان دەبینن
وتاف لێدەدەن و دەڵێن
... نامانەوێ بمرین ...
ئێمە بۆ ئەوە لەدایک نەبووین هەتا بمرین
نامانەوێ نا
بە مردووییش دەمانەوێ بژین ...!

**- ماچ**

وەکوو پشیلە شێتەکان
لە هەموو شتێک ڕادەکەم و یاخی دەبم
یاخی لە خەونەکانی هەرزەیی تۆ
دە دەست لە شەمەندەفەری یاخیبوونم هەڵگرە
من لە یەکەم وێستگەی بەیەک گەیشتنمان
نامەی ماڵئاواییم بۆت نووسی
ماڵئاوا .. ئەی بزە ئەرخەوانییەکانی دەمەو ئێوارانی شیعر
ماڵئاوا .. ئەی دۆژەنە ئەندێشەییەکانی شەوە شەختەییەکان
ماڵئاوا .. گوڵەکەم
من لە ناو ڕووباری با ماچم کردی و لە ناو دڵی بارانیش دا
دەمەوێ پەرداخی چاوەڕوانیت بشکێنم ...!

- **خەون**

ئەو ژنە مامانەی ناوکی دایکمی بڕی و
ئەو پیاوەی یاسینی لەسەر باوکم خوێند
ئێستا وا بە بەرچاوی منەوە سواڵ دەکەن ...!
دوێنێ شەو
منیان کردە پاشا و گەورەی ئەم مەنفایە خۆڵاوییە
دوای چەند ساتێک
کچەکان ، لەبەردەم ژوورەکەم دا مانیان گرت
کوڕەکان ، خۆیان خنکاند
ئەستێرەکان ، چاویان ڕژا
تابلۆکان ، بێ ڕەنگ مانەوە
ئەسپە سپییەکان بەرەو ئاسمان فڕین
کێڵگە لمەکان بوون بە بەرد ...!

سروشت حاشای لە ناوی خۆی کرد
هەموو زیندەوەرەکان سوێندیان خوارد چیتر زاوزێ نەکەن
ئاخ ( ڕۆژگارێکی سەیرە گوڵم )

- ڕەهایی

ڕووت ببنەوە
منیش ڕووتم
با مومارەسە لەگەڵ ئاسمان دا بکەین
ڕووت ببنەوە ڕووت
سروشتیش رووتە
با مومارەسە لەگەڵ ڕووبار و با و گوڵ و کانی و
لەگەڵ خوناوی سەر لێوی ڕێگا و بانەکان دا
بکەین ...!
دە رووت ببنەوە رووت با هەمووومان

هەر هەموومان جلەکانی خۆمان بسووتێنین
لە پەنا بەردەکان نان بخۆین و بخەوین ..!
دە ڕووت ببنەوە ڕووت
با هەموومان
هەر هەموومان لە کاتی توانەوەمان دا
گوێ لە خورپەی دڵی یەکتری بگرین ...!

**- سەفەر**

نیگای چاوت
سەرهەڵدەگرن و کۆچ دەکەن
لەسەر ئارامی باڵی کاتژمێرەکان دەنیشنەوە
مێژووی ڕەهێڵە کۆچەرییەکان
تنۆک تنۆک بارانی شکۆی لێ دەتکێ

چیبکەم
خۆزگە وەک چۆن سینگم دیواری ئازادە
ئاوهاش پەنجەکانم
بەلەمێکی گەورە دەبوون
تا لە سەفەری بەرەو هەوارگەی ڕەهابوونی ڕۆح
هیچ زیندەوەرێکم بەجێنەهێشتبا ...!

# شەونامەی هەورە سپییەکان

ئەو شەوانەی
تارمایی هەرەمێکی فیرعەونی
وەکو تەونی جالجالۆکە
لە کەلێنی نێو مەمکۆڵەی سینگی ئەم شارە بێنازە
دەردەکەوێ و
میلی کاتژمێرەکانیش لە یەکتری یاخی دەبن
کرێوەی هەورە سپییەکان
پەنجە لە گەرووی شەو ڕادەکەن
منیش لە تاو ژانە شیعری شەوم
مەمکۆڵەکان لێک دەخشێنم
ئاگر لە سێبەری خۆم بەردەدەم

ئاخر ئەم شەو
شەوی لە دایکبوونەوەی مرۆڤە
لەگەڵ تریفەی دڵی خۆم و
ترپەی دڵی ئەوکەسانەی
لەم شەوە لە دایک دەبنەوە
گوڵە شەوبۆ
لەسەر دڵی بەرد دەڕوێنم
چاوەکانی گەڵای ئەم وەرزە ماچ دەکەم
لەبەر مۆمی تریفەی مانگ
لاوک و حەیرانی ئەستێرەیی
بۆ باران و گوڵ و درەخت دەڵێمەوە
ئەو شەوانەی
ئۆپەرێتی بووکە بە بارانێی مندالان و
گریان و پێکەنینە بێدەنگەکەی

برۆ لە نێو چاوەکانی دایکم سەرخەوێ بشکێنە
لە پەنجەرەی خەمەکانی بڕوانە
دوور دوور بڕوانە دوور
لە دەلاقەی یادگاریەکانی منداڵیم بڕوانە
موحیبەت و عەشق و تەمەن وا لەوێدا
لە نەرمە پیاسەکانی ئێوارانیش
هەموو شەقامەکان و کۆڵانەکان بەسەر بکەرەوە
بۆ دار بەدار و گەڵا گەڵای باخچەی خانزاد بنووشتێوە
چیرۆکە سپییە ڕیش پەپوولەییەکانی
کچۆڵە عاشقەکان و
خەونە پەمەییە بەرائەتییەکانی منداڵانیش
لە شیعرێکدا بۆم بنووسەوە و
هەر بڕوانە و هەربڕوانە و هەربڕوانە
دوور دوور دوور دوور دوور دوور
گوڵەگیان بەرلەوەی بگەرێیتەوە

بڕۆ لای ( کەریم دەشتی ) و پێی بڵێ
ئەوانەی لە مردن سەما دەکەن
وەک من تەنیان
ئیدی لە مەودوا چ قەدەرێک لە ئامێزی خۆی
هەڵماندەگرێ و
دەمانگەیەنێتە بەر تەکیە پڕ نوورەکەی
مەولەوی و
بخوورێک لە هەیوانیماڵەکانمان
دادەگیرسێنێ ...!
هەر لەسەر ڕێگای خۆت دا
سەرێکیش لە ڕەزە ڕازاوەکەی
پڕ لە شیعرە کریستاڵییە ترێییەکانی
( هاشم سەراج ) یش بدە و پیی بڵێ
گەمەی مۆرفیمەکان تەواو بوو
کەف و کوڵی ( ئایس کەپەچینۆ )ش دامرکایەوە

ئیدی لە مەودوا
بە دیار کام لە سفرە نارنجیەکانی ئەڤینی
دوگمەی ستیانە شەرابییەکەی
مەمکەکانی کام بەیاتریس بترازینین
پێکەکانمان
لەگەڵ بارینی شەهوەتی گژوگیای کام وەرز
ڕۆندکەکانی کام شەوی ڤینۆسی هەڵبدەین
بەمەستی
لە کام ڕازە ڕێواسییە نەرم و شلە وجودییەکانی
خەیاڵ بڕوانین ...!؟
گوڵەگیان
ئەوە منم / باران لە تەنیاییم ئاو دەخواتەوە و
کانیەکانی مردنیش چاو هەڵدینن
لە حەژمەت ئەو ڕۆیشتنەت
نیگا شەبەنگیەکەی بێداریم

لە مەمکە لیمۆییەکەی خودا ڕادەمێنیٚ
چرکە چرکە برژانگە نەرمەکانی تەمەنم هەڵدەوەریٚ
چرکە چرکە بەفری لوتکە و گردۆڵکەکانی ئارامیم
بە خۆرەتاوی عەشقی تۆ دەتوێتەوە
چرکە چرکە سەمفۆنیای یاد و بزە گەرمەکانی تۆ
شەیداتر و سەروەرتر و تەنیاترم دەکات
گوڵەگیان
ئەی شیلەی گوڵە شلێریەکانی نێو بەهەشتی شیعرەکانم
دە تۆزێک ڕەحمت بیٚ و
زوو بگەڕێوە زوو ...!

**کەنەدا / ئابی ۲۰۰۵**
**تیمۆرتنی ( main & wentworth )**
**کاتژمێر ۳،۲۵ خولەکی بەیانی**

# کاتژمێری ڕەنگەکان

لە کوێی ئەم گۆی زەمینە وەستاوین ؟
کام ئاوێنە لە فڕینەکانمان فێر دەبێت جوانتر خۆی بنوێنێ ...؟
کە دەست لە سەوڵ لێدانەکانمان هەڵناگرین ئەوە بۆ کوێ دەڕۆین ...؟
هەر لە نێو مەملەکەتی تراویلکە تەڕتەڕەکانی تاریکی دەمێنینەوە
یان بە نیازین مەرەزە بێ ئارامییەکانی وەرزێکی تر ئاو بدەین ...؟
نازانم هەتاو لە ڕۆژهەڵاتی کام بەهاری تەمەنمان هەڵدێت ...؟
کە بێشکەی هەورە سپیە باراناوییەکەی مەستبوون ڕادەژەنین
دەچینەوە نێو هەوارگە بەفریناوییەکانی سپێدە
یان هەر لە نێو رووبارە هێمنە خەواڵووەکانی مەرگ
گۆرانی بۆ عومرە بەسەرچووەکانی خۆمان دەڵێینەوە ...؟

کە لە قووڵایی دەریا کەژاوەییەکانی بیرکردنەوەکانم ڕادەمێنم
نم نم
لە نێو ڕۆشنایی چاوە بێدارییەکانم
گەردانە گەردەلوولیەکانی گەردنم فڕێ دەدەم
لە ژێر کەپری ڕووناکییەکانی تریفە ڕادەکشێم
سەر بە سینەی خەیاڵە سەر مەستە شەڕابییەکانی شیعر دەکەم
لە نێو خەونە سپییەکان دا ..
بۆ باڵندە و کچۆڵە شەرمنۆکەکانی بەر باران دەگەڕێم
تا چیرۆکە سێکساوییەکانی خۆمیان بۆ بگێڕمەوە و
باسی ئەو وەرزە ئاگراوییانەشیان بۆ بکەم
کە لەگەڵ جوانیەکانی مۆم و میوەجاتەکانی بەهەشت ڕووت بووینەوە
تا بەیانی یاریمان بە پەردەی کچێنی هەور کرد ...!
لە نێو خەونە ڕەشەکانیش دا ...
بە دوای مردنە فەریکەییەکانی خۆمدا دەگەڕێم

نەوەک
لە شەوە شمشاڵییە شلێرییەکان ، ڕەشەبا بە تاریکستانەکانی شەو و
بە گەمە زیکراوییەکانی نێو پەرستگەکان ئاشنایان بکات
لە نێو خەونە سەوزەکانیش دا ..
لە شەوێکی مۆنامۆیی و هارمۆنی دا
لە نێو گەلەرییە ڕووناهییەکانی ئەڤیندا
لەگەڵ لاوکێکی لوولدراو / بە ئاونگترین و ئازیزترین ئارەزووە
زەنگیانەییەکانی
زەمەندا
بە نێو کۆڵانە پێچاوپێچەکانی پێدەشتی کەڤاڵە پشکۆییەکان سەفەرم کرد و
بەدەم خوێندنەوەی
وەرزە بورکانەییەکانی ئاگر و بارێزە بەفریناوییەکانی بەفر و
سۆلاڤە سەرابیەکانی سەحەرِ ، خۆم بە باوەشە گەرمەکانی دەریا
سپارد
لە نیو خەونە سوورەکانیش دا ...

کانیەک کە پڕ لە هاوارەکانی بخووری و باخچەیەک لە ئەڤیندارترین
گوڵە بەنەفسەجییەکان
بوخچەیەک لە زەیتوونیترین وشەم پێشکەس بە غروبە غەمگینییە
ئێوارە هەنارییەکانی
شیعر کرد
لە نێو خەونە زەردەکانیش دا ...
گەڕامەوە / نێو چاوە باڵندە ئاوییەکان
لە سادەیی نیگا موچرکئامێزەکانی مانگ و خۆر و
هەموو ئەستێرە کۆچەرییەکانی ژێر
دەوارەکان و ڕەشماڵەکان و کەپرەکان و چەترە لماوییە لوئلوئیەکانم
ڕوانیییییییی
لە بێدەنگی پەلکەزێڕینە زریانەییەکانی زەمەنیشم ڕوانی
مانایەک ، پاساوێک ، هاوکێشەیەک / بۆ هاتنە لیمۆییەکانی خۆمم
دەست نەکەوت
پرشنگێک ، شەبەنگێک ، تریفەیەک لە بریسکە ترێیەکانی وەرزە

جۆزەردانەییەکانی ئایندەم دەست نەکەوت
لە نێو خەونە
شینی و
ئاوی و
خاکی و
پەمەیی و
پرتەقاڵییەکانیشم دا
بووم بە کۆلارەیەکی ڕۆح شەقار بووی پڕ لە برین
برینە ڕەنگاوڕەنگە شەرمناوییە مۆژگانییەکانی
قەیرە کوڕێکی ڕۆژهەلاتی و
شاعیرێکی ڕۆژهەلاتی و
کچە لەزبیانێکی ڕۆژهەلاتی و
نیگارکێشیک و پەیکەرتاشێک و
کەمانجەژەنێکی ڕۆژهەلاتی و
بە ئاسمانی /

سەدە خەوتووەکانی منداڵیم و
سەدە بێ ناسنامەکانی سبەینێم دا
نەرم دەفڕن
نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم
تا ون دەبن
ون ون ون ون ون ون ون ون ون ون ون ... !
ئەوە چ پەروانەیەکە پشکۆی نێو باڵکۆنەکانی غوربەتیم گەش دەکاتەوە و
هەموو بەیانیانیش دەفتەری خۆزگە هێڤیدارییەکانم پەر پەڕ
هەڵدەدایەوە ..؟
ئەوە چ تاڤگەیەکە لەنێو دەمارەکانی تەنیاییم هاژەی دێ ...؟
ئەوە چ خەیاڵیکە بەنێو جەنگەڵە وێرانبووەکانی جەنگەکان و بەنێو
دەریایە بێ بنەکانی ئەفسانەکان و بەنێو ئۆقیانووسەکانی جیهانێکی تر و
بە نێو هێمنی مەیخانەکانی بەهەشتێکی تر و
بەنێو شەقامە گڕگرتووەکانی دەزەخێکی تر دەمگێڕێ ...!؟
ئێمە دەمرین و

لەنێو کۆشکە سپیەکانیش زەماوەند دەگێڕن
چرای ڕۆشنایی چاوەکانمان دەکوژێننەوە
لەنێو کۆشکە ڕەشەکانیش دا
بە پەیکەری کەللەی سەرمان دەف لێدەدەن
گەڵای درەختەکانی بەختەوەرترین بەهار وا هەڵدەوەرێ
لە نێو کۆشکە سەوزەکانیش دا
مرۆڤەکان نامورادانە ناولەپی خۆیان دەخوێننەوە و دەگەڕێنەوە نێو
خەونە خورافییە خەڵووزییەکانیان
شەپۆلەکان یەک بەدوای یەک بەڕیز دەمرن
لەنێو کۆشکە سوورەکانیش دا
مرۆڤەکان ڕووت دەبنەوە و لە کەنار دەریا ئەفسوونیەکان نۆڤلێتە
ڕۆمانسییەکان دەخوێننەوە
باڵندەکان و پەپوولەکان و ماسیەکان وا کۆچ دەکەن
لەنێو کۆشکە زەردەکانیش دا
مرۆڤەکان لانکی منداڵێتی مانگ ڕادەژەنن و لاوژە ژاکاوە

پەژمووردەییەکان
دەڵێنەوە
لەنێو کۆشکە
شینی و
خاکی و
ئاوی و
پەمەیی و
پرتەقاڵییەکانیش دا /
مرۆڤەکان هەروەک پێشوو دەبن بە پەپوولەیەک
لە سەمفۆنیا سۆزانییە شەرمناوییە ماسۆشییەکانی
نێو ڕۆحە هەلاهەلا بووەکانی
قەیرە کوڕێک و شاعیرێک و کچە لەزبیانێک و نیگار کێشێک و
پەیکەر تاشێک و کەمانجەژەنێکی ڕۆژهەڵاتی ...!
بەنێو ڕەهاییترین ئاسمانەکانی خەون
نەرم دەفڕن ...

نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم
نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم
نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم
نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم
نەرم نەرم نەرم
نەرم
تا ون دەبن ون
ون
ون ون ون
ون ون ون ون ون
ون ون ون ون ون ون ون
ون ون ون ون ون ون ون ون ون
ون ون ون ون ون ون ون ون ون ون ون ون
ون ون ون ون ون ون ون ون ون ون ون ون ون ون ون

ئەوە چ شوعلەیەکی ئۆخژنئامێزە بەسەر گۆنای ژنێکی شەهوەتبازەوە دەبیندرێ ...؟
کە نم نم لەزەتاویترین تاسە بە خەمە ئەسرینییەکانم دەبەخشێ
لە نێو هەر چرکەیەکی تەنیاییم شەپۆلەکانی زیندەگی
ئومێدە ئاڵوودەییەکانی ئایندەم ڕەنگ دەکەن
لە نێو هەر چرکەیەکی زیندەگیم
شەپۆلەکانی تەنیایی
خەیاڵە خورماییە خەنەییەکانم ڕەنگ دەکەن
ئیدی گەرد گەرد دادەچۆڕێمە نێو قوڵایی دەریایەکی پڕ لە میهرترین
ماهە تابانییەکانی عەشق
ئەی ماهی من / ئەی مۆمە مەرجانییە مەریەمیەکەی شەوە
یەڵداییەکانی من ، چیتر ناتوانم خۆم بە وەیشوومەترین و عەدەمیترین و گەردەلوولیترین
وەرزە وەیشوومییە عەدەمییە گەردەلوولیەکان بسپێرم
چیتر ناتوانم خۆم بە

لچکە کراسی سەر گەردانەترین و پەرتەوازەترین و گێژەنیترین
ڕابردووە
سەر گەردانییە پەرتەوازەییە گێژەنییەکان شۆڕ بکەمەوە ، ئەی ماهی من
چیتر گویّ لە چرکەی ئەو کاتژمێرانەی سەرسینگم ڕاناگرم کە نەتوانن
شەوانان / هاواری هەناسەکانم و گریانە گەرمەکانی دڵم بخوێننەوە
کە نەتوانن / نهێنی فەنتازیترین جوانییە سیحرئامێزەکانی ڕەنگەکانم
بۆ ئاشکرا بکەن ...!
ئەی ماهە مۆرفینییە بڕونزییەکانی بەرائەت
لەنێو کۆشکە سپییەکان دا
لە ئامێزی خەونێکی سپی
کاتژمێرە سپییەکان / گەمە بە هەستەکان و تاسەکان و نیازەکانی
دڵە پراوپڕ لە خەمە خومارییە خوناوییەکانمان دەکەن
لەنێو کۆشکە ڕەشەکان دا
لە ئامێزی خەونێکی رەش
کاتژمێرە رەشەکان / شووشەی شەڕابە

پڕ لە سەفایە سیرامیکییە سەرخۆشییەکانمان دەشکێنن
لەنێو کۆشکە سەوزەکان دا
لە ئامێزی خەونێکی سەوز
کاتژمێرە سەوزەکان / گوێ لە سەمفۆنیایە سەوسەنیە سوریالییەکانی
نێو باخچە ئەوینییەکانی دڵمان ڕاناگرن
لەنێو کۆشکە سوورەکان دا
لە ئامێزی خەونێکی سوور
کاتژمێرە سوورەکان / لەبەر غروورببوونی وەرزە مەست مەستە
مەستانەییەکانمان ، بەنێو ڕازیانە ڕەونەقیەکانی دڵی ئێمە
ڕانابوورن
لەنێو کۆشکە زەردەکان دا
لە ئامێزی خەونێکی زەرد
کاتژمێرە زەردەکان / لەنێو کەژاوەی مەرگە شێنەییەکانمان
لە ئاوێنە ئاوییەکانی ئایندەمان ڕانامێنن
لەنێو کۆشکەکانی تر و لە ئامیزی خەونەکانی تر و

کاتژمێرە ڕەنگاڵەییەکانی تریش
تابلۆیەکن لە غەریزە چەپێندراو و کێڵگەیەکن لە پشکۆی سەربڕاو و
خەرمانێکن لە یادگارییە بەجێماوەکانی
نێو جەستە شەقار بووە پڕ لە تاسە و برینە ئاگرینەکانی
قەیرە کوڕێک و شاعیرێک و لەزبیانێک و نیگارکێشێک و
پەیکەرتاشێک و
کەمانجەژەنێکی ڕۆژهەڵاتی
بۆ کۆڵارە غەریبە غوربەتییەکان دەڕوانن
کە بەنێو ئاسمانی
دڵە سپی سپییەکانی عەشق و
چاوە ڕەش ڕەشەکانی شەو و
پێدەشتە سەوز سەوزەکانی سروشت و
خەیاڵە سوور سوورەکانی بسپیدە و
زەردەپەرە زەرد زەردەکانی زەمەن
نەرم دەفڕن

نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم نەرم
تا ون دەبن
ون ون ون ون ون ون ون ون ون ون ون ون ون ون ون ...!

# ئاوێنەکانی چارەنووس

١

ژنێک لەنێو کێڵگەکانی با
خۆی لە گەردەلوولی خەونەکانم ئاڵاندووە
یاری بە زەنگیانە ڕەنگاورەنگەکانی تەمەنم دەکات
مۆمی نێو چاوەکانی مانگ دادەگیرسێنێ
لەودیو وەرزەکانی ڕووناکی خۆی ڕووت دەکاتەوە
لەگەڵ گەڵاکانی ئاو و
برژانگەکانی گیا سەمام بۆ دەکات و
نەرم نەرمیش بە ئاوێنە شکاوەکانی چارەنووسم
پێدەکەنێ ...!

## ٢

منی مەستر لە باران و .
فێنکتر لە بەیانی
شل شل و تاو تاو
کێڵگەکانی با و ڕووناکیەکانی مانگم بە جێهێشت
خەونە خرپنەکانی خۆمم گرتە باوەش
توند توند ... توند توند توند
هێندەم گوشین
تا زیندەگیم بەخشی بە جوانییەکانی تریفە
شل شل و تاو تاو
بۆ نێو قووڵاییە تاریکییەکانی شەو
چوومە خوارەوە
شارێک پڕاوپڕ لە گومبەزەکانی گوناە و

دۆڵێک پراوپڕ لە ئەشقیای سەرمەدی
سروود و سوورەتە سێوییەکانیان دەخوێند
تا دەهات
هەنگاوەکانم بە گوڕتر و گەرمتر دەبوون
تا دەهات
مەشخەڵە بڵێساوییەکەی نێو چاوەکانم
ئەشکەوتەکانی ئاسمان و
ئاسمانەکانی نێو دەریای ڕۆشن دەکردەوە
تا دەهات
بارێزە سەوداسەرییەکانی خەیاڵم
سەرفراز و شەهوەتباز و ڕەنگاڵەتر
سەرمەستتر و سەفاتر و سۆزانیتر
شۆختر و شەنگتر و شەنگەبیتر
ڕوونتر و ڕەنگینتر و ڕەهاتر دەبوون ...!

منیش / بێپەروا و بێپەروا و بێپەروا
سەرفراز و سەرمەست و سەفا و سۆزانی
شەهوەتباز و شۆخ و شەنگ و شەنگەبی
ڕەنگاڵە و ڕووت و ڕەنگین و ڕەها
خۆم دایە دەست
کانیاوە بەفریناوییەکانی جوانی ...!
جوان جوان بازمدایە نێو
ئاوێنە سەرابییەکانی ئەڤینی
لەوێندەرێ /
لە ئایندەی خۆمم ڕوانی
لە تیشکە دوورەکانی کازێوە و
لە مەرجانە کریستاڵییەکانی عەشق و
لە وەرزە ئارامییە میهرەبانییە ڕابردووەکانی تەمەن
شل شل و تاو تاو
لە نهێنییە پەرێشانییەکانی غوربەت و

لە جەستە مۆماوییەکانی خۆرەتاو و
لە کەپرە ڕەنگاوڕەنگەکانی ئایندە و
لە پەپوولە باڵشکاوەکانی
نێو مەراقەکانی خۆمم ڕوانی ...!
سروودەکان و سوورەتەکان و خەونەکان و هاوکێشەکان و
پرسیارەکان و گومانەکان و نهێنییەکان و ڕازەکان و ئومێدەکان و
شیعرەکانم شیکردەوە
جەستەی خۆم و ئاوێنە شکاوەکان و گەڵا وەریوەکانم
کۆکردەوە .. شل شل
مرواریيە ڕەنگ هەناریيەکانی سەرسینگی شاژنە شلێرییەکانی
نێو عیشوە و نازی پەلکەزێڕینەشم / کۆکردەوە ...!
سەرگەردان و بێپەروا
یاخی و یاخی و یاخی
یاخی / لە خەونە جوانە مەرگبووەکانی
دەشتە کاکی بە کاکییەکانی غوربەت

یاخی / لە چڵەنێرگزە چاوگەشەکانی
نێو خۆزگە و هەناسەکانی سەرسینگی دایکم
یاخی / لە کچۆڵە شەرمنۆکەکانی کۆڵانە قوڕاوییەکانی منداڵیم
یاخی لە هاوارەکانی نێو سەدە بازنەییەکانی زەمەن ...!
یاخی و یاخی و یاخی
هەر بەو حەسرەتە کوشندە دڵتەڕانەوە
شل شل و تاو تاو
بە ئاوێنە شکاوەکانی چارەنووسی خۆم تێر پێکەنیم ...!

**ئایاری ٢٠٠٥**

# خەونەکانی مردن

من گەشتێکم کرد
پڕاوپڕ بوو لە سنەوبەرەکانی دۆزەخ
پڕاوپڕ بوو لە هەورە تریشقەکانی مەرگ
لە خەونە بازنەییەکانی ڕووناکی
پرسیارێکیشم پێ نەبوو بۆ گەڕانەوە
نەمدەزانی نیگاکانم لە مەنزڵگەی
چ شەپۆلێک چ باڵندەیەک هێور دەبنەوە
بە پانتایی شەقامەکان لەنێو خەیاڵە ونبوە بەرائەتیەکانی
گوناە دەسووڕاینەوە
خۆم و توورەگەیەک لە ڕەنگە جوانەکانی شیعر و
بوتڵێک شەڕاب و هیچی تر

من بوخچەیەکی نەکراوە بووم
پڕاوپڕ بووم لە نهێنی ماسولکە سپیەکانی بەفر
پڕاوپڕ بووم لە ئەگریجە نەسیمییەکانی خۆرەتاو
بە ئاوازە گێلاسەییەکانی سروشت
بێشکەی مێژووم ڕادەهەژاند
من لەگەڵ شەوە جوانەمەرگبووەکانی بەهار ڕۆیشتم
بەو خەیاڵەی تا ئەبەد جارێکی تر وێنەی بتە شکاوەکانی با
نەکێشمەوە و
چیتر ڕوخسارە فرمێسکاوییەکانی شکستەکانم نەبینمەوە
ڕۆیشتم خۆم لە نێو دارەبازە ئەستێرەییەکانی قەدەر بینیەوە
تاو تاو لە ڕۆشنایی گەڵا هەڵوەریوەکانم دەڕوانی
بۆ نێو قوڵایی زیکرە هێمنە شەوانەییەکانی ئاو شۆڕدەبوومەوە
جارجار گوێم لە سەمفۆنیایەک دەبوو ، هەستم دەکرد
هەموو دەمارەکانی جەستەم خاو دەکاتەوە و پێڵووی چاوەکانیشم
بە سەما دەهێنێ

دەستەکانم دەبنە دوو باڵی ئاوریشمی بۆ فڕین و
هەنگاوەکانیشم لەگەڵ چرکە گەرمەکانی شەو
ئاوێتەی نێو ناخی یەکتری دەبوون
هەندێجاریش لەبنار کێوە سەخت سەختەکانی ئەڤین
بەدیار سفرە ڕەنگاو ڕەنگەکانی با گۆرانیمان دەگوت
لەنێو مەمکۆڵەکانی زەمەن لە سەرخۆشبوونی هەورمان دەروانی
ئیدی لەو ساتە ڤینۆسیانەدا
من پەرتبوونەکانی خۆمم بیرچووبوو و
نەمدەزانی من ئەو مرۆڤە هەلا هەلایە دڵ شەقار بووەم
کە هەر پەنجەیەکم لە کیشوەرێک و
هەر پەراسووەکم لە ئۆقیانووسێک و
هەر گۆشەیەکی دڵم لە مەملەکەتێک بەجێماوە
بە تەنیشت دارستانێکی خەوتوودا تێپەڕیم
گوێم لە ناڵە ناڵی کێڵگە خەملیوەکانیش دەبوو
بەدەم وەنەوزی مەرگەوە ، ئایەتی گزنگە سەحەرییەکانی

بوومەلەرزەیان دەخوێند
ڕۆیشتم
خۆم و خەیاڵە بروسکەییە مەشخەڵاوییەکانی گەنجێتیم و
چەند یادگارییەکی یاداشتکراو بە پێنووسەکانی ئاو و هیچی تر
هەموو
پێدەشتەکان و بیابانەکان و ئۆقیانووسەکان و کیشوەرەکانم بڕی
دواجار
بۆ ماسیەکان و پیرە دار هەنجیرەکانی نێو گەڕەکە هەژارنشینەکانی ئاگر و
بۆ ئەو کچۆڵانەی
لە ئاهەنگی ماڵئاواییم مۆمیان بۆ داگیرساندبووم ، نووشتامەوە ...!
بۆ ئەو شەقامانەی
دوگمەکانی سوخمە پەمەییەکەی خۆیانیان بۆمان دەترازاند
بۆ سەدە بریندارەکانی نێو ماڵە تاریکەکەم
بۆ هەیکەلی
ئەو فەیلەسوفانەی بە بەرچاوی خۆمەوە سووتێندران ، نووشتامەوە ...!

بۆ دواجار ئاوڕێکم بۆ دواوە دایەوە بینیم
لەشکری / مردووەکان و ژنە مەمک بڕاوەکان و پیاوە کوێرەکان و
منداڵە ( دڵ شووشەکان ) ..
هەر هەموویان بە دوامەوە بوون
هەموو مەمکە فڕێدراوەکان و چاوە هەڵکۆڵدراوەکانم دۆزییەوە
مەمکەکان / هەروەکجاران گەرم بوون
شێوەی پەنجەکانم و پەڕەی گوڵی لێوەکانمیان بەسەرەوە مابوو
ئای کە جوان بوون / لە باڵا خوداوەندییەکەی ( ئەفرۆدیت ) ...
جوانتر بوون
چاوەکانیش بە نیگایەکی نەرمەوە لێیان دەڕوانیم
وام هەست دەکرد گلەییم لێدەکەن و دەڵێن
کەی وادەی مردنی ئێمە بوو کەی ...؟
ڕۆشنایی دڵە شووشەکانیش لەژێر پنجە گیاکان
خۆیان حەشاردابوو
گەڕامەوە دووبارە

کێڵگەکان و دارسنەوبەرەکان و هەموو دەریاکان و کیشوەرەکانم
بینییەوە ...!
دووبارە
هەموو مۆزەخانەکان و گۆڕستانەکان و گومبەزەکانم بینییەوە
ئەو ڕەشماڵانەی کە لە قژی کچۆڵەکان دروستکرابوون
گەڕامەوە نێو ماڵە تاریکەکەم
لەشکری / مردووەکان و ژنە مەمک بڕاوەکان و پیاوە کوێرەکان و
منداڵە دڵ شووشەکان / هەر هەموویان بە دوامەوە بوون
هەموو دەرگای ژوورەکانم بۆ کردنەوە
ژوورێک پڕاوپڕ لە ئەلبومەکانی منی منداڵ
ژوورێک پڕاوپڕ لە ئەلبومەکانی منی لاو
ژوورێک پڕاوپڕ لە ئەلبومەکانی منی عاشق
ژوورێک پڕاوپڕ لە ئەلبومەکانی منی باوک
ژوورێک پڕاوپڕ لە ئەلبومەکانی منی مردوو
بە / گۆشە بە گۆشەی یادگارییەکانم دا هاتمەوە

ساڵ بە ساڵ و مانگ بە مانگ ، ڕۆژ بە ڕۆژ / گەڕامەوە دوا
تاوێک لە ساتە خۆش و ناخۆشەکانم ڕوانیەوە
لە مردن و لە دایکبوونەکان و جەنگەکان و جێژووانگە پڕ ترسەکانی
شەوەکانم ڕوانییەوە
لەشکری / مردووەکان و ژنە مەمک براوەکان و پیاوە کوێرەکان و
منداڵە دڵ شووشەکان هەر بە دوامەوە بوون
ژوور بە ژوور ، گۆشە بە گۆشە
ساڵ بە ساڵ
چرکە بە چرکەی تەمەنی خۆمم بەسەر کردەوە
دواجار
لەو ژوورە گیرساینەوە کە پڕ بوو لە ئەلبوومەکانی منی مردوو
لە دەروازەی چاوەکانی منی مردوو چووینە ژوورەوە
شەقامەکان ڕووناک ڕووناک
شەوەکان پڕ تریفە و دیمەنەکان دڵڕفێن و
بەیانیەکان پڕ لە خەندە و

دنیایەکی جوان بوو نێو چاوەکانی من ...!
چوومە نێو ساتە لاشعورییەکانی ئەوسای خۆم
بەرائەت و
پێکەنین و گریانەکانی خۆمم بینییەوە ...!
نامە دڵدارییە سادە و خنجیلانەکانیشم بینییەوە
کە لە نێو دەمارەکانی عاتیفەم هەڵگیرابوون
بەرەو گۆشە سپیەکانی دڵمان ئۆغرمان کرد
دنیایەکی ئێجگار گەورە بوو دڵی من ...!
ڕۆژهەڵات بە گەورەیی خۆی لەوێندەرێ لێی ڕاکشابوو
لاپەرەکانی خەونەکانم هەڵدایەوە
لەنێو منداڵدانی خۆزگەکانم / مەراقە گەورەکان و
ئومێدە تازە پشکوتووە خنکێندراوەکانی خۆمم بینییەوە
وێنەی ئەو کچانەی خۆشم ویستبوون
بێوژنەکان و کوڕ و کچە لەشفرۆشەکان و
شێتە ناسراوەکانی شار و هەر هەموویانم بینییەوە

هەزاران هەزار بوخچەی نەکراوەی ڕەنگاو ڕەنگ
یەکێک پڕاوپڕ لە شیعری نەنووسراو
یەکێک پڕاوپڕ لە خەون و مەراق و ئومێد
یەکێک پڕاوپڕ لە خۆزگەی منداڵانە
یەکێک پڕاوپڕ لە برینی ئەڤینی
یەکێک پڕاوپڕ لە حەزەکانی سێکسی
یەکێک پڕاوپڕ لە خەمەکانی تەنیایی
یەکێک پڕاوپڕ لە نامۆیی و غوربەت
ئاخ / ئەلبومەکانی منی مردوو
چۆن من و لەشکری مردووەکان و ژنە مەمک بڕاوەکان و
پیاوە کوێرەکان و منداڵە دڵ شووشەکان و ...
هەر هەمووومانی هێنایە گریان ...!
ئێستا لەوە تێدەگەین
بۆچی مردنەکانی ئێمە بێدەنگی بە ڕووبارەکان و
ڕەشی بە شەوەکان پۆشیبوو ...!

ئای کە تاوانبار بووین
نەمانتوانی ، لەنێو بەلەمەکانی باران ئۆقرە بگرین
ئێستا /
لە زیکرە بەردەوامەکانی ئاو و
لە سروودەکانی ڕەشەبا و
لە شنەبایە خامۆشەکانی ڕووناکی و
لە خەونە ڕەنگاورەنگەکانی مردن / تێدەگەین
ئێستا لە نهێنی
بریسکانەوەی قژە زەردە زێڕینیەکانی پایز و
لە گۆرانییە پڕ نەغماوییەکانی بەیانیان و
سەمای هەڵمە گرگرتووەکانی هاوین و
لە هەڵوەرینی برژانگە نەرمەکانی گوڵ / تێدەگەین
بۆیە بڕیارمان دا هەر لەوێندەرێ
لەنێو ئەلبومەکانی منی مردوو بمێنینەوە
دیسانەوە شۆش بکەین

تا ئەوکاتەی / باڵندەکانی ئارەزووومان
بە ڕەهایی ی ی ی
لە ئاسمانە شینەکانی خەون و
خەونە خۆشەکانی خەیاڵ و
خەیاڵە گەرمەکانی خۆشەویستی
لە شەقەی باڵەکانیان نەدەن / نەگەڕێینەوە ...!

**ئۆکتۆبەری ۲۰۰۲**

.. لە ڕۆمانی ( دواهەمین هەناری دنیا ) ی بەختیار عەلی وەرگیراوە .
... لە ئەفسانەکانی یۆنانی کۆن / ئەفرۆدین خودای بەزم و لەزەت و سێکس بووە .

# فیردەوسی شەوە یەڵدایییەکانی لم

**( بە یادی ١٨٢ هەزار پەپوولەی سپی )**

لە نێو بازنەکانی سێبەر
دەسووڕاینەوە
ئەسمەرییانە لە ئەزموونەکان و لە ئایندە و
لە مردنەکانمان دەڕوانی
لەو ئێوارەیەش لە دایکبووین
کە درەنگ وەخت بوو
بۆ چوونە جێژوانگەی خۆرەتاو
بۆیە نامورادانە
خۆمان لە نێو زەمەنە تاریکەکانی
مەملەکەتی لم بینییەوە ...!

ئەسمەرییانە
لە خەونە شەوینیەکان و
شەباهەنگی ئاسمانە فیردەوسییەکانمان
دەڕوانی
بێئاگا لە بزە گەرمەکانی گیا
بێئاگا لە گۆرانییە ئومێد بەخشەکانی باخچە
خۆمان لە نێو قەدەری ڕەنگەکان و
لە نێو سێبەری شکستەکان / بینییەوە
لەم ڕۆژەوە
سەدەکان لە نێو هاواری ئێمە ڕاکشاون
مێژووش لە نێو برینەکانمان
لەو ڕۆژەوە
هەر دەفڕین و کێڵگەیەکمان نییە بۆ نیشتنەوە
دەجەنگین و دەرگایەکمان نییە / بۆ دەرچوون
پەنجەرەیەکمان نییە بۆ ڕوانین

نازانین
خۆر لە کاملاوە هەڵدێ و
پەپوولە سپیەکانی عەشقیش
لەکام گوڵزار دەنیشنەوە ...!
کاتێک بە کۆمەڵ دەنێژراین
واماندەزانی
مەرگ هەر لە ئەزەلەوە / بۆ ئێمە لە دایکبووە ...!
کاتێک هەموو ئێوارانێک و شەوانێک
وەکو گەڵا بەسەر سینگی بیابانەکان هەڵدەوەراین
واماندەزانی
خەزان هەر لە ئەزەلەوە
لەنێو هەناسە سیبریاییەکانی ئێمە لە دایکبووە ..!
ئەی فریادڕەسەکەم / دەپێم بڵێ
ئێمە لەسەر کام ئەستێرە
هاتووینەتە بوون ...؟

لە نێو کام دەریاش بە مردنە ئاوییەکانت بەخشین ...؟
دەپێم بڵێ
ئێمە بە ڕەنگی کام یەکێک لە ڕەنگە جوانەکانی
پەلکەزێڕینە دەناسرێینەوە
کە هاتین
ئێمە سەمفۆنیایەکی وەهمی بووین
لە نێو کۆڵانە سەهەندییەکانی باران / دەبیستراین
کە هاتین
ئێمە مانگێک بووین لە بەفر
لە ئاسمانە سەرابییەکانی ڕووناکی / هەڵهاتین
بێئاگا لە لاوژە بێدارییەکانی ئاو
لە گریانە باڵندەییەکانی سنەوبەرەکان
ئێمە هاتووین
تا ئەبەدییەت بە ﻟﻢ و
سەروەریش بە ڕەشەبا ببەخشین و

خۆشمان بمرین
ئێمە هاتووین
تا ڕۆشنایی بە شەو ببەخشین و
خۆشمان دارستانێک بین لە شەوەزەنگ
سۆمای چاوەکانمان
بە شەپۆلەکان ببەخشین و
خۆشمان ڕەوە ئاسکۆڵەیەکی بێ بینا ...!
ئێمە هاتووین تا تەمەنی گەنجێتیمان
هەگبەی پڕ لە خەونە ئاڵەکانمان
ببەخشین ...
بە / ئەفسانە قەدەرییەکانی گەردەلوول و
بە / گەردەلوولە ئەفسانەییەکانی قەدەر و
بە / قەدەرە گەردەلوولە ئەفسانەییەکان ...!
ئێمە لە بەیانییەکی سۆزانی
لە بنار مەمکۆڵە وشکهەڵاتووەکانی

سەدە خوێناوییەکان
له ئامێزی بەهارێکی ون و
لەنێو هەناسەی
شەوغە هێمنەکانی غوربەت / له دایکبووین
بێئاگا له لاوکه بەسۆزەکانی بەفر
بێئاگا له تەنیاییه هەمیشەییەکانی تاراوگه
بەرەو قووڵاییه بێبنەکانی لم چووینه خوارەوه
چ دنیایەکی تاریک و بێدەنگ بوو
ئەم فیردەوس و ماڵه ئەبەدییه تاریکه لماوییەمان ...!!!
ئێمه لەوێندەرێین
له قووڵترین ئۆقیانووس و
له دوورترین کیشوەره تەماوییەکانی دنیا
هەموو شەوێ
له جەنگێکی بێ ئامان داین
لەگەڵ تاریکییه کریستاڵییەکانی جەسته و

وەرزە ڕەشەکانی دوای مردنی کات و
گەمە ئاتەشییەکانی نێو ( کۆچێکی هەتا هەتایی )
هەموو شەوێ
لە گەڕانێکی بێ وچان داین
بۆ دۆزینەوەی مرواریيە گیاییەکانی
گەردنی گەلاو
حەرفەکانی جوانی نێو قەسیدە بخورییەکان و
هێڵە بازنەییەکانی نێو چاوەکانی ئەستێرە
ئێمە لەوێندەرێ
گەریدەترین لە با
بۆ گەیشتن
بە پەرستگە ئاگراوییە زەردەشتییەکانی خەیاڵ
لەوێندەرێ
ڕۆندکەکان ڕووبارێکی پەمەیین و
خەونەکانیش پێکهاتەیەکن / لە ئاگر و شەڕاب

خۆزگەکان پرشنگێکن / لە مەرجانەکانی ئەڤین
لەوێندەرێ
دڵە دڵۆڤانییەکان
لە حەسرەت و لاوکە فیراقییەکانی مانگ
خەریکە گڕ لە نەشئەی سەماکانیان هەڵدەستێ
لەوێندەرێ خەیاڵەکان
هەموو شەوێ باڵدەگرن و دەفڕن
دوور دوور دەفڕن
هەندێکجار هەر ناگەڕێنەوە
پەنجەرەکان هەمیشە کراوەن
چاوەکانیش ئەوەندە لە چاوەڕوانی دان ...!
شەوەکان ئەوەندە درێژن هەر نابڕێنەوە
گۆرانییەکانیش هەموودەم دووبارە دەبنەوە
ئای کە بێ ئۆقرەیە ساتەکانی چاوەڕوانی
لەم فیردەوسە تاریکەدا ...!

## پیتە جوانەمەرگبووەکان

**ک**

کورەیەک لە نێو خەونەکانم
هەموو شەوێ
سەری پەنجەکانم و قەڵەمەکەم و
دەمارەکانی بیرکردنەوەم ، دەسووتێنێ
کەوێک لە بناری شاخەکانی دڵم
بۆم دەخوێنێ
من لەوەتەی هەم
هەموو شەوێ لە نێو خەونەکانم
جوانەمەرگ دەبم
مەرگێکی ئارام ، مەرگێکی شێنەیی
لەگەڵ وەرزەکانی تەمەنم
گەورە دەبێ ...!

و

وێنهیهک له وێنهکانی خوا
لهنێو پیته جوانهمهرگبووهکانی یادگاریم
دۆزییهوه
ئاخێکم هەڵکێشاو گوتم
دەبێ ڕۆژێک دابێ و منیش
وێنهی ماڵهکهی خۆم
له پهنا ئهستێرهیهک
یان له باوهشی شهپۆلهکان
بدۆزمهوه ...؟!!

ر

ڕووبارێک
بە هێمنی لەگەڵ خۆیدا دەمبا
دەمبا دەمبا دەمبا
دەمبا دەمبا دەمبا
دەمبا دەمبا دەمبا
منیش هەر لێی ڕادەمێنم
تا بە پەرستگەکانی عەشق و
گۆڕستانی پیتە جوانەمەرگبووەکانی
نێو شەوە شیعراوییەکانی خەیاڵم
دەسپێرێ ...!

د

دەنگ دەنگ دەنگ
ڕەنگ ڕەنگ ڕەنگ
نە دەنگ هەیە ، نە ڕەنگ
هەر دەڵێی مرۆڤەکان
لەگەڵ پیتەکاندا مردوون
هەر دەڵێی باڵندەکان
لە باوەشی
ئەستێران و بروسکەدا خەوتوون
ئەم دنیایە چەند کشومات و بێدەنگە
دەریاکان و تاڤگەکان و ڕەشەباکان
چەند بێدەنگن بێدەنگ ...!
هەر دەڵێی لە ناو چاوەکانی
پیتە جوانەمەرگبووەکاندا خەوتوون ...!

س

سێوێکی حەرام
حەرام حەرام حەرام
حەرامترین سێوی مەملەکەتی غوربەتم خوارد
تا ئێستا
سێ هەزار و سێ سەد و سی و سێ
سێوی حەرامم خواردووە
بەڵام / من بە پێچەوانەی ئادەم
تا سێوە حەرامەکان بخۆم
زێتر بە قووڵایی ئەم غوربەتخانەیە
دەچمە خوارەوە ...!

## ت

تاوسێک
ڕەنگینتر لە میوەجاتەکانی بەهەشت
نەخشینتر لە ڕوخسارە ئێستاتیکییەکەی ئاگر
لە نێو وەرزەکانی تەمەنم
باڵەکانی خۆی دەکاتەوە و
لەگەڵ خۆیدا
بەنێو سێبەرە شینەکانی خەیاڵ
دەمفرێنێ ...!

١

ئاوی نێو لەشی ژنێکی هەورین
وەکو باران بەسەر
کێڵگە و دارستان و باغ و بێستانەکانی
ڕۆحم دا دەبارێ
دوای توانەوە منیش دەڕژێمە نێو دەریاکان
لەوێندەرێش جارێکی تر دەتوێمەوە
هەر
دەتوێمەوە دەتوێمەوە دەتوێمەوە
تا ون دەبم ...!

## ن

نامەیەکم بەدەست گەیشت
هیچ ناونیشانی لەسەر نەبوو
لە نێو نامەکەدا پیتەکان بە جوانەمەرگبوویی خەوتبوون
وشەکان بۆنی فرمێسکی گوڵیان لێدەهات
پیتەکان بەر لە مردنیان
ئەم مەسیجەیان بۆم نارد بوو
( ئێرە وێستگەیەکە بۆ مردن
ئێرە وێستگەیەکە بۆ عەشق
ئێرە وێستگەیەکە بۆ ژیان
لێرەدا ، بە ئارامی
جووت بن ، عەشق بکەن ، سەما بکەن
ئێرەماڵمانە ماڵ ...! )

**ئەیلوولی ٢٠٠٥**

# گومان

ڕەنگە هەموو شتەکان ڕاست بن ...!
ڕەنگە گەر سروشت نهێنی ڕەنگەکانی نەدرکاندبا
جوانتر خۆی بنواندبا
گوڵەکان / سیحراویتر خۆیان خزاندبایە نێو دیدەمان و
دەریاکانیش موسافیرەکانیان بە مەرگ نەسپاردایە
ڕەنگە هیچێکیش لەم ڕوانینانەی من ڕاست نەبن ...!
ڕەنگە گەر من لە دایک نەبام
ڕەوەندی هەموو شکستەکان بە ئاراستەیەکی تر گوزەریان کردبا و
وشەی حەقیقەت و گوناه نەهاتبانە بوون ...!
پێکهاتەکانی
جەنگ و مەرگ

یاخیبوون و عەشق ، مانایەکی تریان هەبا
ڕەنگە من تەوەزەلیترین نووسەر بم
کە نەمتوانیبێ تێنوێتی خوێنەرەکانی خۆمم شکاند بێ
ڕەنگە من هەموو شیعرەکانی خۆمم
تەنها بۆ دامرکاندنەوەی حەزە سێکساوییەکانی خۆم نووسیبێ
لەگەڵ ئەوەش دا ڕەنگە
ئەزەلیەتی / شۆڕش و مانەوە بۆماوەییەکانی میهر
لە دەرەوەی بازنەی بیرکردنەوەکانی من
شتێکی زۆر تووڕەهات و هیچ و پووچ بن
بۆیە من هەمیشە بە گومانم
لە بوونی خۆم
لە شیعرەکانم
لە بینینەکانم
لە خەونەکانم
لە ئایندەم

لەو مرۆڤەی خۆشم دەوێ
لە بیرۆکە ئەفسانەییەکانی
لە خاچدانی مەسیح و
ئایەتە زەردەکانی خورافیات
لە شەپۆلە بێ ئارامییەکانی زەمەن
لە هەموو ووووووو شت ...!
من پارچەیەکم لە گومان و
گومانیش کەرنەڤاڵێکە لە من
پێکەوە
بەنێو شەقامەکانی تەنیایی و غوربەت
پیاسە دەکەین و
پێکەوە شەوانان دەخزێینە نێو جێگا و
پێکەوە هەناسە دەدەین و
هەر پێکەوەش گەورە دەبین ...!

**دیسەمبەری ٢٠٠٣**

# مەرگی من و تەنیایی ژنێک

## ١

لەنێو قووڵایی تەنیاییم دا
شەوانان / پڕاوپڕ دەبم لە نیگەرانییەکانی ئاگر و
لە خەونە ڕەنگاورەنگەکانی ئاو
لە نێو قووڵایی بێدەنگیم دا
بەیانیان / گۆزەکانی تەمەنم پڕ دەبن لە ڕووناکی و
وەرزەکانی نێو بیرکردنەوەکانیشم پڕ دەبن
لە پرسیاری عەبەسی
من ئێستا ، سەرمەسترم لە ڕەنگەکانی سروشت و
ونترم لە گەڵا وەریوەکانی نێو چاوەکانی با
بە نێو کۆڵانەکانی تەنیایی

تەنیا تەنیا / لە ژێر باران دا سەما دەکەم و
وجودییانەش بەرەو ئاسمانی باڵندە سپییەکان دەفڕم
من ئێستا / ڕووناکترم لە مانگەشەوەکانی
نێو خەیاڵەکانی مردن
سپیترم لە مەمکۆڵە بەرسیلەییەکانی شەو
بێدەنگ بێدەنگ / جلەکانم دەدەمە دەم با و
بەرەو دۆزەخی نێو جاویدانیەتی مانگ دەڕۆم

٢

ئەی ژنە جوانەکەی
نێو نیگەرانییەکانی ئاگر
خۆ تۆش لە نێو قووڵایی تەنیاییدا بۆ مانگ دەڕوانی
دە تۆش ستیانەکەت بدە دەم با
با ڕووت ببیەوە وەکو من

لەم مانگەشەوی تەمەنمان
هەر چ نەبێت با بزەیەک بێتە سەر گۆنامان و
شەوێک لە ئامێزی یادەکانم بمێنیەوە

## ٣

دەسکە گوڵێک
لە نێو گوڵدانێکی ڕەنگ ئاگراوی
لەسەر مێزی ماڵی ژنێکی تەنیا دانراوە
گوڵەکان ،
چاوەکانیان پراوپرە لە نیگەرانی
لە دەرەوەی ماڵەکەش
باڵندەیەکی سەوداسەر و سەرمەست و سپی
دەسووڕێتەوە
چاوەڕێیە / پەنجەرەیەک بکرێتەوە و بێتە ژوورەوە

هەر چ نەبێت . ، تاوێک گوڵەکان بۆن بکات و
ئینجا ، پەڕەی باڵەکانی و لەش و لاری بداتە دەم با و
ڕووت ڕووت بەرەو ئەستێرە سپییەکان
بفڕێتەوە ...!

## ٤

دوێنێ شەو تا بەیانی
لە ئامێزی ڕووناکی ژوورەکەم دا خەوتم
دەرەوەش تاریک تاریک
بەر لە خەوتن تا چاو بڕکات
لە شەقامەکانی ڕووناکیم ڕوانی
جگە لە مەرگی خۆم و تەنیایی ژنێک
چیترم نەبینی
دواتر لە مەملەکەتی تاریکیشم ڕوانی
ئەستێرەی ڕەنگاو ڕەنگ و

باخ و بێستانی سەوز و
حۆری باڵا شووشەیی و
گەردەلوولەکانی لم و
ڕووتبوونەوەی سەحەر و
هەموو شتێکم بینی هەموو شتێک
کەڤاڵێکی جوان و بەهەشتێکی
ڕووناک ڕووناک بوو تاریکی ...!

٥

باران دەبارێ و
گوڵە سپیەکانی هەناسەم سپیتر دەبن
باران دەبارێ و
سێبەری دار سنەوبەرەکان دەچەمێنەوە بۆ با
باران دەبارێ و
تریفەی مانگ عەشق لەگەڵ شەپۆلەکانی

ئاو دا دەکات
باران دەبارێ و
سەدەکان بەدەم سەماوە حیکایەتی
مەرگی من دەگێڕنەوە
باران دەبارێ و
دەریا مۆنامۆی نێو خەیاڵەکانی ژنێکی تەنیا دەژەنێ
باران دەبارێ و
بەفر نیگەرانییەکانی ئاگر بۆ سەوزایی باس دەکا
باراب دەبارێ و
تاریکی دێتە نێو ژوورەکەم و کتێبەکانم
لە نێو مەمکۆڵەکانی خۆی هەڵدەگرێ و
دەڕواتەوە

## ٦

گوڵە سپیەکانی هەناسەم هەڵدەوەرن
باران هەر دەبارێ
سێبەری دارسنەوبەرەکان پیر دەبن
باران هەر دەبارێ
تریفەی مانگ و شەپۆلەکانی ئاو
پەردەی کچێنی و ستیانەکانیان دەدەنە دەم با
باران هەر دەبارێ
سەدەکان بەدەم سەماوە حیکایەتی مەرگی خۆیان
بۆ تەنیاییم دەگێڕنەوەو
باران هەر دەبارێ
دەریا مۆنامۆی خەیاڵەکانی خۆی
بۆ ژنێکی تەنیا دەژەنێ و

باران هەر دەبارێ
ئاگر نیگەرانیەکانی خۆی بۆ سەوزایی و بەفر باس دەکا
باران هەر دەبارێ
خۆم و کتێبەکانم لە نێو مەمکۆڵەکانی تاریکی
ڕەشماڵێک هەڵدەدەین
بارانیش هەر دەبارێ و هەر دەبارێ هەر دەبارێ

٧

باران هەر دەبارێ و
منیش لە نێو هەناسەکانی شەوەزەنگ
بۆ مەمکۆڵەکانی شیعر و
گوڵە فیردەوسییەکانی عەشق و
شەوەمە ڕووتەکانی ڕووناکی دەڕوانم
باران هەر دەبارێ و

منیش لە ئامێزی خەیاڵە سپیەکان
بۆ ئەو ئەستێرانە دەڕوانم
کە پڕاوپڕن لە باڵندەی تەنیا
باران هەر دەبارێ و
منیش لە مردنە شێنەییەکانم
بۆ ئەو ئۆقیانووسانە دەڕوانم
کە ژنە ئاوییەکان
چیرۆکی تەنیایی خۆیان بۆ ماسیەکان
دەگێڕنەوە
باران هەر دەبارێ و
منیش تا چاو بڕکات هەر دەڕوانم
تا مەرگی خۆم و سەمای ژنێکی تەنیا و
زەردەخەنەی ئاگر و فڕینی باڵندە سپیەکان
لەنێو ئاسمانێکی تر و
لەسەر ئەستێرەیەکی تر دەبینم

تا چاو بڕکات هەر دەڕوانم
بۆ شەوە زەنگە مەستە مەستەکانی تاریکی و
بۆ گزنگە پرشنگە پرشنگەکانی ڕووناکی و
بۆ ئەستێرە دوور دوورەکانی خەون ...!

**سەرەتای ٢٠٠٦**

# ئاوێتەبوون

من لە نێو باخچەکانی بارانەوە
بۆ یەکەمجار
چاوم بە جوانییە سیحراوییە سوریالییەکانی
باڵای تۆ کەوت
من لە نێو جوانییە بورکانییە زایەندییەکانی
باڵا سنەوبەرییەکەی تۆوە
بۆ یەکەمجار
باران ڕۆح و هەناسە و هەستەکانمی تەڕ کرد
لە نێو تابلۆیەکی عەبەسیدا
من و تۆ و باران
لە قەدوباڵای یەکتری ئاڵابووین

وەک لاولاوەی
سەر پەنجەرەی ئاپارتمانەکانی بەهەشت
لە نێو باوەشی یەکتر ڕاکشابووین
وەک ڕەنگە ڕووتەکانی تریفە و ئاو
لە نێو ڕۆحی یەکتریدا خەوتبووین
وەک ڕەکەگانی درەخت و خاک ...!

**ئایاری ٢٠٠٧**

# نیگایەک بەسە بۆ مردن

نەرم نەرم
بە نێو پەرژینە دۆزەخاوییەکەی قەدەر و
بە نێو هەڵچوونە شکۆفەییەکانی شەودا ڕەتبە
کە شیرازەی ڕۆح و
سیمای تاڤگە سیحراوییەکانی ئومێد دەگۆڕن
نیگایەک بەسە بۆ مردن
بە نێو ئەو ئێوارە هێمنە هەنارییانەش دا ڕەتبە
کە مانایەک بەبەرائەتی پەپوولە و
هەناسەیەک بە باخچەکانی عەشق دەبەخشن
بگەڕێوە نێو
وەرزە موسافیرەکانی دەریا

گوێ لە ناڵەی کاتژمێرە بەساڵاچووەکانی تەمەن ڕابگرە
کە کەڤرێژن لە لاوکە حەسرەتییەکانی نامورادی
نیگایەک بەسە بۆ مردن
بە نێو وەرزە یاخیبووەکانی زریان و
کەرنەڤاڵە پڕ هاوارەکانی بروسکەدا ڕەتبە
ئەی ڕۆحە ڕەهاکانی نێو خەونە شووشەییەکانی ئایندەم
وەرە شیلەی گوڵە شلێرییەکانی خەیاڵم هەڵمژە
کڵپەیەک بە ڕامووسانییە شیرینیەکانی نێو شیعرەکانم ببەخشە
ئەی شۆخ
ئەوانەی لەگەڵ ئێمە سەمایان کرد
هەموویان مردن
ئەوانەی لەگەڵ ئێمە
لەنێو وەرزەکانی قەدەر ئایەتی یاخیبوونیان خوێند
هەموویان مردن
ئەوانەی لەگەڵ ئێمە

لەنێو فڕینە سپیەکانی هەور خەم و یاداشتەکانی
عەشقیان نووسییەوە
هەموویان مردن
فریای چوونەوە نێو
زیکرە گەرمەکەی
کەڕنەڤاڵی عاشقان و مژینی مەمکە
گەنمییەکانی
کچە کۆچەرییەکانی فیردەوس نەکەوتن
ئەی ڕۆحە نەسیماوییەکەی پایز
هێور هێور
بگەڕێوە نێو بەهەشتە هەمیشە بژوێنییەکان و
لە جوانی خۆزگە سەرمەدییەکانت بڕوانە
خەمەکانت بە ناسکی شنەی با و
ڕازەکانیشت بە باران ببەخشە
نیگایەک بەسە بۆ مردن

بە نێو چاوەکانی پەلکەزێڕینەدا ڕەتبە
بگەڕێوە نێو ماڵە تاریکەکانی خۆرەتاو
ئەی شۆخ
منیش لەگەڵ خۆت دا بەرە
لە نێو دیوانە شیعرێکدا هەڵم بگرە
بمبەرە نێو سێبەری دوای نیوەڕۆیە
گەرم گەرمەکانی خۆشەویستی
لە نێو بێشکەی منداڵیم دا
لە ژێر دار هەنجیرێک ڕامهەژێنە
وەرە بمبە و
لەنێو ماڵە تاریکەکەی نیشتیمانم جێمبهێڵە
بە ماچ و گوڵەکانی عەشق دامپۆشە
بم سپێرە بە قەدەری ئاو و
بە سپیدە نارنجییەکانی سەوزایی

وەرە ئەی شۆخ
منیش لەگەڵ خۆت دا بەرە
لەنێو نیگا گەرمەکانی زەردەخەنەت هەڵم بگرە
لەنێو شەقامە گڕگرتووەکانی ئاوەدانی جێمبهێڵە
بە هەناسە و بە ڕەهێڵە ئەبەدییەکانی عەشق دامپۆشە
بم سپێرە بە قەدەری خەونە بریندارەکان و
بە شەوگارە ڕووناکەکانی ئاوێتەبوون
دەوەرە دەی بمبەرەوە
نیگایەک بەسە بۆ مردن / ئەی شۆخ
نیگایەک بەسە بۆ مردن ...!

**تەمموزی ٢٠٠٦**

# تارمایی ژنێکی سپی

شەوەکان ڕەت دەبن
منیش / لە کەژاوەی مردن
دوور دەکەومەوە
ڕۆژەکان ڕەت دەبن
تارمایی ژنێکی سپی
لە باخچەکانی تەنیاییم نزیک دەبێتەوە
سەدەکان ڕەت دەبن
شەقامەکان پڕ دەبن لە گومان
وەرزەکانی
نێوان من و خەونەکانی
نێو تارمایی ژنێکی سپی

پڕ دەبن لە ترس
دوورییەکانی
نێوان من و دەریاکانی
نێو تارمایی ژنێکی سپی
پڕ دەبن لە عەشق
هۆ ژنە گیاییەکەی
نێو تارماییە سپیەکانی بەفر و
نێو خەیاڵە گەرمەکانی
شەوە شیرینیەکانی شیعر
منیش لە چاوەڕوانی تۆدا
لە نێو یادگارییەکانی درەخت و
گریانەکانی بەرد و
شەوە مۆماوییەکانی مانگ دا
بە دیار
چەند وێنەیەکی پڕاوپڕ لە ڕوانینی پەپوولەیی

بە ڕێنووسە نارنجییەکانی خەفەت
ڕۆمانەکانی عەشق دەنووسمەوە
منیش
لە چاوەڕوانی تۆ دا
لە نێو شەوە مانگەشەوەکانی
نێو چاوەکانی ماسی و
لە نێو خەونە پایزییەکانی کات و
لەنیو بالکۆنە فێنکەکانی خۆرەتاو دا
بە دیار چەند کتێبێکی پڕاوپڕ
لە بازنە نەغماوییەکانی غوربەت
حەسرەتە نارنجییەکانم دەنووسمەوە
شەوەکانم ڕەت دەبن
تارمایی ژنێکی سپی
لەسەر سینگی مۆنالیزای تەمەنی من
دەردەکەوێ و

وێنەی کۆدەکانی عەشق و
زەردەخەنەیەکی پڕ لە شیعرم بۆ دەکێشی
ڕۆژەکان و وەرزەکان و سەدەکانم
ڕەت دەبن
تارمایی ژنێکی سپی
لە مردنە ڕۆمانسییەکانم
نزیک دەبێتەوە
نزیک نزیک نزیک
چاوەکانی لەسەر یەک دادەنێ و
لە نێو بازنەکانی بێدەنگیدا
دەگرێ و دەگرێ و دەگرێ
منیش لە چاوەڕوانی
شەوێکی شیرینی نێو باوەشی ئەم ژنەدا
ئێوارە ئەسمەرییەکان و
وەرزە وەنەوشەییەکان و

مانگە مۆماوییەکانم ... دادەگیرسێنم
منیش لە چاوەڕوانی
مژینی لێوە ناسکەکانی ئەو ژنەدا
لە سەر سینگی مۆنالیزای خەونەکانم
وێنەی ژوورێک و سیسەمێک و مۆمێک
لەسەر ئاوێنەی ڕوون ڕوونەکانی خەیاڵیشم
وێنەی سێوێکی سوور سور دەکێشم
ڕۆژەکانم ڕەت دەبن
لە نێو ڕوخسارە نارنجییەکەی یادەکانم
سەبەتەیەک پڕ لە مێوە و
دەلاقەیەک پڕ لە کتێب و
گوڵدانێک پڕ لە گوڵ
سەمام بۆ دەکەن و لە ئامێزم دەگرن
وێنەی شەوێکی شیرینی پڕ لە شیعرم
بۆ دەکێشن

شەوێکی پڕ لە باران و
پڕ لە هاوار و پڕ لە شەپۆل و پڕ لە فڕین
ڕۆژەکان و شەوەکان و سەدەکانم
ڕەت دەبن
تارمایی ژنێکی سپی
لەسەر سینگی مۆنالیزای هەناسەی من
دەردەکەوێ و
دێتە نێو کێڵگە سپییەکانی ڕۆحم
بە نێو کۆڵانە کچێنییەکانی
دەمارەکانی عاتیفەم پیاسە دەکات و
بەسەر پەیژەکانی خۆشەویستیم هەڵدەگەڕێ
لەنێو کازێوەی گلێنەی چاوەکانم
ڕادەکشێ
بۆ هەتا هەتایە

لەوێدا دەمێنێتەوە
وەرزەکانی من ڕەت دەبن
منیش لە چاوەڕوانی
شەوێکی شیرینی نێو باوەشی ئەو ژنەدا
لەسەر سینگی مۆنالیزای برینەکانم
بە ( کۆدەکانی داڤنشی )
وێنەی چەمانەوەی خۆم دەکێشم
بۆ هەتا هەتایە
لە نیو فڕینەکانی عەشقێکی ئەبەدی
لەنێو
خەیاڵە بەفرینییە کریستاڵییەکانی تەنیایی دا
دەمێنمەوە
کتێبێک پڕ لە شیعری عاشقانە
بە ڕێنووسە نارنجییەکانی غوربەت

بۆ نیگار و
بۆ ڕوخسارە ئاوێنەییەکەی
ئەو ژنە سپیە لێو بەبارە / دەنووسمەوە

**سیپتەمبەری ٢٠٠٦**

# (سێرنادا)

هەموو ساڵێک لەو دەمەدا
لەگەڵ هەناسەدان و چاوهەڵهێنانی
یەکەم شەوی نێو مەمکۆڵەکانی مێژوودا
لە نێو ماڵە تەنیاییەکەی بەفر
بە دیار فرمێسکەکانی مانگ و
زەردەخەنەکانی ئاگردا
شۆڕەژنێکی خەیاڵ بەنەفسەجی
لەژێر تارای
تاسە زەنگیانەییەکانی عەشق و

لەنێو کاتژمێرەکانی سەوزایی دا
گوێ لە سێرنادای مۆم ڕادەگرێ
منیش هەر لەو شەوە ڕەوشەنییەدا
نەرم نەرم لە نێو ڕامانە زایەندییەکانم
مەست مەست
کۆڵانەکانی غوربەت و
یادگارییەکانی مردن و
بەلەمە نەوەزیەکانی قەدەر / جێدەهێڵم
دەگەڕێمەوە
نێو کەژاوەی ڕامووسانی و نێو پەرستگەکانی پاکبوونەوە
لەوێندەرێ
لەنێو ماڵە ڕەبەنییەکەی باران
ئاگر لە جانتای سەفەر و
لە پەراسووەکانی تەنیاییم بەردەدەم
بەدەم خوێندنەوەی ئایەتەکانی عەشق و

میلۆدە هەنارییەکانی سێرنادا دا
پێکە گێلاسەییەکانم هەڵدەدەم
بەرەو قووڵاییەکانی دەریای توانەوە و
بەرەو مەتارێزی
زایەڵە زێڕینییەکانی زەردەپەڕ
شۆڕدەبمەوە
بە ڕەنگە خۆڵەمێشییە خەملیوەکان و
هێڵە شەپۆلاوییە ماوییەکانی
نێو تابلۆیەکی زەیتوونی بێئۆقرەی خوماریی دا
لاوکەکانی تەنیایی و وەرزەکانی خۆرئاوابوونم
ڕەنگ دەکەم
هەر لەودەمە
لە یەکەم شەوی لەدایکبوونی عەشق
لە نێو خەونەکانی
گوڵ و ئاوێنە و شمشاڵ دا

بە دیار بزە گەرمەکانی ڕەشەبا و
سێبەرە ڕووتەکانی ئەستێرەدا
بەدەم سووتان و
ئەندێشە نغرۆییەکانی نوێژی شێوان
لەگەڵ خۆم دا
شەنگە شلێرییەکانی شەو و
کڵپە کچێنییەکانی کرێوە و
سروە سروشییەکانی سەحەر / بە سەما دەهێنم
تا خەونە ونبووەکانی
نێو دەمارە وشکهەڵاتووەکانی ئارەزووم
تەڕ تەڕ دەبنەوە
وەک ڕەیحانە ڕەشەکانی / نێو ڕۆحی شەونم و گیا
سەما سەما سەما
لێرە سەرسامی و لەوێندەرێ سەما
لێرە فرمێسک و لەوێندەرێ فڕین

لێرە حەشیشە و لەوێندەرێ عەشق
سەما هەمیشە سەما
فڕین هەمیشە فڕین
عەشق هەمیشە عەشق
هەموو ساڵێک لەو دەمەدا
لەنێو مەریەمیترین عەشقی خودایی و
لە ژێر ڕەشماڵی بنار خەیاڵە تاوسییەکان دا
بە تاسە مەرجانەییەکانی گەردنی ئاگر
گوێ لە سێرنادای عەشق ڕادەگرم
لەوێدا / لەنێو هەناسە گەرمەکانی ئەو شەوەدا
دەمێنمەوە / دەمێنمەوە / دەمێنمەوە
خۆم بە عەبەسیەتی
تاڤگەکانی عەشق و نافورەکانی میهر دەسپێرم ...!

کۆتایی کاتژمێرەکانی ۲۰۰

* سێرنادا .. ناوی پارچە مۆسیقایەکی خۆشەویستییە

# نیشتیمانە سپییەکەی نێو خەونەکانی دایکم

لە نێو هەناسەی
وەرزە مەستەکانی ڕەبەنیترین موسافیر
ڕەنگەکان
بێ ڕۆح ... بە ئەسپایی
بەسەر شەقامەکانی مەرگ
ڕادەبوورن
بەرەو چارەنووسێکی نادیار
ون ون دەبن
تێکەڵ بە هاوارە تەنهاییەکانی
بێ ئارامیترین باڵندەکانی خودا دەبن
بە ئەسپایی

بە دەوری ڕەبەنیترین
ئەستێرە سپییەکانی خەون
دەسووڕێنەوە
موسافیرەکان
لە ژوورێکی تەنیا
لەگەڵ گەڵاکانی تەنیایی دا
دەلەرێنەوە
لە گۆڕێکی تاریک
لەگەڵ گەردەلوولەکانی تاریکیدا
ژووان دەگرن
ڕەنگەکانیش بە ئەسپایی
لە نێو یادەوەرییەکانی باخچەکان ون دەبن
ئەو باخچانەی
پڕاوپڕن لە نائومێدی
ڕەنگەکان بە ئەسپایی

لە نێو ڕووناکییە بێ ئومێدەکانی
خۆرەتاودا پیاسە دەکەن
نامورادانە
لە نێو خەونە ڕەبەنییەکان دا دەمرن
بەر لە مردن
وەسیەتەکانیان
لە نێو جانتای موسافیرە غەریبەکان جێدەهێڵن
ئەو موسافیرانەی
جانتاکانیان پڕاوپڕە لە خەونە سپییەکانی گەڕانەوە
پڕاوپڕە
لە شیعرە چاو بە فرمێسکەکانی
نێو ژوورە چۆڵ و هۆڵەکانی غوربەت
ئەو موسافیرانەی
گوڵە لۆتسییەکانی ڕۆحیان
ڕەیحانە ڕەشەکانی هەناسەیان

بۆنی غەریبییان گرتووە
تەمەننای بینینەوەی نیشتیمانە سپییەکەی
نێو خەونەکانی دایک دەکەن
موسافیرەکان
تا هەتایە لە نێو دەریاکانی غوربەت دا دەمێننەوە
لە نێو کۆلانە تاریکەکانی زەمەن دا ون دەبن
لە پەنجەرەکانی تەنیایی
سەیری خۆرئاوابوونەکانی تەمەن دەکەن
لە ژێر سێبەری دار سنەوبەرەکانی ئاو
بە تەزبێحە گوڵگوڵینەکەی باران
وەرزەکانی نێو فرمێسکەکانیان دەژمێرن
ژنەکانی نێو پەلکەزێڕینەی خەیاڵیان
بە پەرتبوونەکانی
نێو باخچەی نائومێدییەکانیان دەسپێرن
ئەوە منم

کەرنەڤاڵێک لە شەپۆلەکانی مردن
هاوارێک لە سێبەرەکانی تەنیایی
مۆسیقایەک لە ئاوازە ناسکەکانی ونبوون
بەسەر گۆنای لاولاوە ڕەنگ زەردەکانی
نێو چاوەکانم دەبیندرێ
ئەوە منم / شانە سڕەکانی پەنجەکانم
پڕ بوون لە پەرستگا خوداییەکانی غەریبی
پەیکەری ئومێدەکانی خەیاڵم
هەموو بەیانیان
خوناوە خەملیوە خومارییەکان دەردەکەن
ئەوە منم /
ڕۆحێکی شەکەت و ماندووی
ڕێگا ونەکانی غوربەتم
لە ژێر تەرزە ڕەشەکانی شەو
خۆشم نازانم بەرەو کام مەنزڵ ڕێدەکەم

دێمەوە
دێمەوە ... دێمەوە ... دێمەوە
پیاسەکانم دەست پێدەکەمەوە
لە ژێر باران و تریفە
خەمە شمشاڵییەکانی بروسکە بەسەر دەکەمەوە
لە ژێر کەپری ڕازە هەنارییەکانی ڕووناکی
ڕادەکشێمەوە
هاوارەکانی دەریا هێور و
گوناهەکانی مانگ سپی دەکەمەوە
ئەوە منم / دێمەوە
لە بنار کانییەکانی عەشق
دەگیرسێمەوە
بۆ گوڵە حاجیلە و خاڵخاڵۆکە پرتەقاڵییەکان
دەنوشتێمەوە
وەکوجاران

گوێ لە سەمفۆنیای ڕووبارەکان و
گوێ لە لاوکەکانی خاک / دەگرمەوە
لەگەڵ نەورەسەکانی بەر باران
پڕ بە سیەکانم هەناسە دەدەم
لەگەڵ تاوسە جاویدانییەکانی ئەڤینداری
سترانە هێمنییەکانی هەور دەچڕینەوە
دێمەوە/
خۆم لە جوانییەکانی گەڵاو
لە ڤینۆسییەتی بەفر وەردەدەم
لە نێو خۆڵەمێشی خەونەکانم دەگەوزێم
لە نێو شەپۆلە شاگەشکەییەکانی مەستبوون
تا ئەبەد نارۆمەوە ...!

**نیسانی ۲۰۰۷**

# چاوەڕوانی و خەیاڵە هەنارییەکانی عەشق

## ١

گوڵەگیان
من ئەمشەو
لە نێو خەونەکانم دا
لە چاوڕوانیت دا دەبم
تۆش بە ئەسپایی وەرە
بێئەوەی پەڕەسێلکەکانی مانگ و پەپوولەکانی با
بەخەبەر بهێنی
خۆت لە نێو
هاواری قولینگەکان و نیگاکانی درەخت

حەشار بدە
بەنێو :
تخوبەکانی مەرگ و
ڕۆحە سپیەکانی خاک و
شەپۆلە خەوتووەکانی
نێو دڵی ڕەشەبادا ڕەتبە
گوڵەگیان :
من هەمیشە لە چاوڕوانی تۆدام
سبەی شەویش
لەنێو خەونەکانم دا
لەگەڵ زەردەخەنەکانی پاییز و
سەرمەستبوونەکانی شیعر
لە چاوڕوانیت دا دەبم
بۆ خۆم بە بێدەنگی
دەچمە نێو دۆزەخەکانی هەور و

دەچمە نێو سەدەفە نەرمەکانی گیا و
هەر لە چاوەڕوانیت دا دەبم
تۆش وەرە و
بە تەنیشت گۆڕستانەکانی دەریا و
بەنێو خەیاڵە هەنارییەکانی عەشق دا ڕەتبە
بۆ چەند چرکەیەک
گوێ لە کاتژمێرە ڕەنگ هەڵبزرکاوەکانی هەناسەم ڕابگرە

گوڵەگیان :
من بۆ هەتا هەتایە هەر لە چاوەڕوانیت دا دەبم
دووسبەی شەویش
لە نێو خەونەکانم دا
یاری لەگەڵ پەپوولەکانی خودا دەکەم
وەکو باران دەڕژێمە نێو کۆڵانەکانی سەوزایی
گوێ لە چیرۆکەکانی کچە عەتر فرۆشەکانی بەهەشت ڕادەگرم و

هەر لە چاوەڕوانیت دا دەبم
بۆ دڵدانەوەی شەو
یادگارییەکانی خۆم دەسووتێنم و
هەر لە چاوەڕوانیت دا دەبم
تۆش بە ئەسپایی
بەنێو کەرنەڤاڵەکانی خۆرەتاو
بە تەنیشت ماڵە بێدەنگەکانی بەفردا ڕەتبە
بەبێدەنگی خۆت بکە بە ژووردا و
بۆ چەند چرکەیەک
گوێ لە سەمفۆنیا ئاگراوییە بریناوییەکانی دڵم ڕابگرە
گوڵەگیان :
ساڵێکی تریش وەکو ئەمشەو
وەرزێکی تریش وەکو ئەمشەو
سەدەیەکی تریش وەکو ئەمشەو
لەنێو خەونەکانم دا

شەڕ لەگەڵ ئەو جەللادانە دەکەم
کەدەیانەوێ نەغمە و سەمای تریفەی مانگ بشێوێنن
بەگژ ئەوبروسکانەدا دەچم
کە بەبێ خوێندنەوەی
ئایەتەکانی نێو مەمکۆڵەکانی گەڵا
ئاگر لە کتێبەکانی عەشق بەردەدەن و
هەر لە چاوەڕوانیت دا دەبم
تۆش نەرم نەرم ...
بەنێو قەدەرەکانی تۆفان و
بە نێو سێبەرەکانی ئاودا ڕەتبە
بە مەستی
خۆت بکە بەنێو ژوورە ئاوریشمیەکەی دڵم
بۆ چەند چرکەیەک
لە ڕووتبوونەوەی ئەستێرە سپیەکانی نێو هەناسەم بڕوانە
گوێ لە سرووده سەوداسەریەکانی مردنم ڕابگرە

## ٢

گوڵەگیان :
من ئەمشەو
لەنێو خەونەکانی مردنم دا
لە چاوەڕوانیت دا  دەبم
سبەی شەویش
لەنێو خەونەکانی مردنم دا
هەر لە چاوەڕوانیت دا دەبم
ساڵێکی تریش وەکو ئەمشەو
وەرزێکی تریش وەکو ئەمشەو
سەدەیەکی تریش وەکو ئەمشەو
لەنێو خەونەکانی مردنم دا
هەر لە چاوەڕوانیت دا دەبم

گوڵەگیان :
تا پێڵووی چاوەکانم و
یەکە یەکەی پەراسووەکانم  وەقسەدێن
تا کوکوختیەکانی هەناسە و
یەکە یەکە دەمارەکانی عاتیفەم وەقسەدێن
تا غەریزە چەپێندراوەکانی ڕۆحم و
یەکە یەکە دەنکە تەزبێحەکانی یادگاریم وەقسەدێن
من هەر لە چاوەڕوانیت دا دەبم .

گوڵەگیان :
تا نافوورە ڕەنگاوڕەنگەکانی عەشق
لەزیکرو سووتانەکانیان هێور دەبنەوە
تا هەوێردە ڕەنگ پاییزیەکانی مانگ
لە فڕین و ونبوونەکانیان هێور دەبنەوە
تا شەونمی سەرپەنجەڕەی بەیانیەکانی ڕەشەبا

لە مەستبوون و سەماکانیان هێور دەبنەوە
من هەر لە چاوارِوانیت دا دەبم
من هەر لە چاوەڕوانیت دا دەبم
تا لەنێو :
ئاوێنەکانی ئاودا
باڵا سنەوبەریەکەی تۆ دەبینم
تا لەنێو :
ئاوێنەکانی با دا
مەمکە خرپنەکان و ڕۆحی ڕووت و زەردەخەنە و
جوانیەکانی نێو خەیاڵت دەبینم
تا لەنێو :
ئاوێنەکانی گیا دا
کەروێشکە زەردەکانی نێو غەریزە و
نێو هەوەسە گەرمە سەرشێتیەکانت
لە لەیلاخە فێنکەکانی نێو ڕۆحتەوە بەرەو ڕووم دێن

منیش بۆ خۆم بەبێدەنگی
بخورە خۆڵەمێشیەکانی نێو حەزەکانم هەڵدەکەم و
لە چاوەڕوانیت دا دەبم
گوڵەگیان : من هەمیشە لە چاوەڕوانیت دا دەبم
وەک کەمانجەیەکی خەنەیی
کە لە چاوەڕوانی دەست و پەنجەی کەمانجەژەنێکی دڵ بە برین و
عاشق دایە
وەک شمشاڵێکی قەمیشی
کە لە چاوەڕوانی ،
لێوە لەرزیوەکانی پیرەمێردێکی دڵبەخەمی ئەشقیا دایە
تۆش نەرم نەرم
خۆت بکە بە نێو شەوگارە ڕووناکەکانی دڵم
تەنها بزەیەک و تەنها نیگایەک و هیچی تر
تەنها و تەنها و تەنها
بۆ چەند چرکەیەک

ئاوێزانی
خەونەکان و مردنەکان و ئایەتەکانم بە
بۆ هەتا هەتایەش
بۆ نێو خەرەندە تاریکە ڕهوشەنیەکانی تەنیایی و
بۆ نێو ڕۆژهەڵاتە تەماوییە ئەڤینیەکانی ونبوونم شۆڕبەرەوە !

**سیبتەمبەری ۲۰۰۷**

# ڕۆژە تاکەکانی هەفتە

## یەکەم

### ١

من لە ڕۆژە تاکەکانی هەفتە
ئارەزوو دەکەم
هەر بە تەنیا بڕوانم
بە تەنیا بیر بکەمەوە
بە تەنیا گۆرانی بڵێم
هەر بە تەنیاش سەما بکەم

ئارەزوو دەکەم
بە تەنیا
بچمە نێو ئاگردانەکانی بەفر
شکۆفە مردووەکانی نێو ڕۆحی لم
نافوورە کریستاڵیەکانی لافاو
ڕەشەباکانی پایز
خەونە شینەکانی خودا
ئەستێرەیەکی ئاوسی سپی
ئارەزوو دەکەم
بەتەنیا
بەسەر پەراسووە ڕووناکییە سەرخۆشەکانی شەو
هەڵبگەڕێم
لەنێو دوای نیوەڕۆیە یاخیبووەکانی مانگ
بمێنمەوە
خۆم لە جوانیەکانی ئەستێرەو

لە ڕۆمانسیەتی ئاسمان وەربدەم
هەندێجاریش ئارەزوو دەکەم
دەسکە گوڵێک لەسەر گۆڕی یادەوەریەکانم
جێبهێڵم و
تەنیایی خۆم بە کچێنی بروسکە و
بە پاکیزەیی ڕەشەبا بسپێرم

## ٢

لە ڕۆژە تاکەکانی هەفتە
لەنێو خەیاڵە گەرمەکانی کوڕێنی
ئارەزوو دەکەم
بەدیار هەر کانیەکی تەنیایی
نیگارێک بکێشم
لە هەموو خۆرئاوابوونەکان ورد ببمەوە
بۆ گەردنی هەر باڵندەیەکی کۆچبەر

ملوانکەیەک دروست بکەم
لە نێو سپیدە و هەناسە و ڕامانەکانی
هەورە دوور دوورەکان بمێنمەوە
هەندێجاریش لە پەنجەرەکانی بارانەوە
لە فرمێسکەکانی پەپوولە و لە زەردەخەنەکانی با
بڕوانم
هەر بڕوانم
تا دەگەمە نێو خەونەکانی ئاو
لە مردنی شەپۆلەکان و
لە نهێنیەکانی خۆرەتاو ورد ببمەوە
لەنێو نائومێدیەکانی گەڵا ڕابکشێم
گوێ لە لاوک و خەمەکانیان ڕابگرم
هەندێجاریش
دەرگا و پەنجەرەکانی ژوورەکەم
بە ڕووی خۆمدا دادەخەم و

جگەرەیەک دادەگیرسێنم
تەنیا تەنیا بیر لە تەنیایی خۆم دەکەمەوە
تا دەبم بە باڵندەیەکی سپی
خۆم لە نێو هەوارگە سەوزەکانی پایز دەبینمەوە

٣

لە ڕۆژە تاکەکانی هەفتەدا
خۆم و کوڕێنیم
لە نێو شەقامە فێنکەکانی دۆزەخ دا پیاسە دەکەین
لە ڕووبارە ڕووتەکان و
گەڵا و درەختە ڕووتەکان و
تریفە و ڕووناکییە ڕووتەکان و
تارمایی و تاریکییە ڕووتەکان ... دەڕوانین
خۆمان بە پەرستگەکاندا دەکەین

لە ژنە ڕاهیبە ڕووتەکانیش دەڕوانین
کە :
مەمکۆڵە و چاوەکانیان
نیگا و خەیاڵەکانیان
پڕاوپڕە لە ڕووبارەکانی ئارەزوو ... !

## ٤

لە ڕۆژە تاکەکانی هەفتەدا
ژنێکی تەنیا
عەشق لەگەڵ پەیکەری کوڕێنیم دا دەکات
شەوەکانم پڕ دەکات لە مۆم
وەرزەکانم پڕ دەکات لە ڕووبار
فرمێسکەکانم پڕ دەکات لە ماچ
خەونەکانم پڕ دەکات لە زەردەخەنە
مردنم پڕ دەکات لە سەما

تەنیاییم پڕ دەکات لە ترێ
ئارەزووم پڕ دەکات لە ئاگر
نیگام پڕ دەکات لە نەسیم

٥

لە ڕۆژە تاکەکانی هەفتەدا
ژنێکی عاشق
سەبەتەیەک نامەم بۆ دەنێرێ
نامەی یەکەم :
وێنەیەکی خۆی بە ڕووتی لەسەر لاپەڕەی یەکەمی
نامەکە کێشاوە و
لە ژێریشی دا نووسیویەتی
من لەنەوەی خوداوەندەکانم
مەمکەکانم لە جنسی ئاگرن
سەرت بنێ بە سینگمەوە

لە بنار مەمکەکانم و
لەنێو مندا ، خەون ببینە
هەموو شوێنێکم ماچ بکە
هەموو شەوێ مەمکەکانم وەک دوو چرا
تا بەیانی بۆت دەسووتێن .

**نامەی سێیەم :**

من ستیانی ئومێدەکانی خۆم
بە سەوزایی دارسنەوبەرێک بەخشیوە
شەوێک لەگەڵ پیربوونی گەردەلوولدا خەوتووم
ڕووناکیەکی سۆزانی بەنێو جەستەم دا گوزەری کردووە
لەو ڕۆژهوە لە زمانی باڵندە و ئاو تێدەگەم
وەرە ئەی گوڵ با پێکەوە « ڕیسک « بکەین
ببین بە مونەوەرترین عاشقی خودا

**نامەی پێنجەم :**
هەموو جارێک
کە من خۆم ڕووت دەکەمەوە
خاک و بەفر
پەپوولە و مانگ
باران و ڕووبار
گوڵەگەنم و سەوزایی
بروسکە و هەور
خۆرەتاو و گەڵا
لم و با
شەپۆل و ماسی
لەچاوەکانی یەکتری دەڕوانن و دوای بزەیەکی گەرم
دەخزێنە نێو ئامێزی یەکترییەوە
ئای خۆزگە منیش وەکو ئەوان

هەموو شەوێک خۆم لە نێو ئامێزی تۆ دەبینیەوە
وا پێدەچێ ئێمە نامورادترین عاشقی خودا بین .. !

**دووەم:**

گوڵەگیان ، ڕێگەم بدە

با بێمە نێو ئارەزووە ڕەیحانەییەکانت

لەوێدا ونبوونی کات و سەرخۆشبوونی زەمەن

بنووسمەوە

با خەونەکانی خۆم و خۆزگە شەرمینیەکانی کوڕێنیم

لەنێو بازنەی تەنیاییەکانی تۆدا ڕەسم بکەم

لەنێو فیردەوسی ڕووتبوونەوەی تۆ

هاواری شەقامە تاریکەکانی نیشتیمان و

پەیکەری سووتانەکانی خۆم بکێشم

ئارەزوو دەکەم

بە ڕەنگی چاوەکانی تۆ

سروشتێکی تر لە نێو ڕووبەری خەیاڵم و
دنیایەکی تر لەنێو بیناییم و
ئایندەیەکی تر بۆ گەیشتنەوەم بە تۆ ، ڕەنگ بکەم .
ڕێگەم بدە گوڵەگیان
لەنێو تەنیاییەکانی خۆم
ڕێگەی فیردەوسێکت پێ نیشان بدەم
کە لەسەر نەخشەی ئەم دنیایەدا نەبێ
پڕاوپڕ بێ لە هەناسە و ئاوەدانی
لەنێو مردنەکانی خۆمدا
باخچەیەکت پێ نیشان بدەم
کە لە نەخشەی بەهەشتەکاندا نەبێ
پڕاوپڕ بێ لە پشکۆ و لە خونچەکانی ژیان
لە نێو ئاسمانە شینەکانی نێو خەیاڵی من و
ئۆقیانووسە بەرینەکانی نێو فرمێسکەکانی تۆ
کیشوەرێک هەیە پێی دەڵێن ، کیشوەری عەشق

چاوەڕوانم بە گوڵەگیان
منیش دێم و
لەبنار مەمکۆڵەکانت لەنێو تۆدا دەمێنمەوە
شەوەکانم / ئارەزووەکانم / تامەزرۆییەکانم
ڕووت ڕووت دەکەمەوە
وەک ڕووتبوونەوەی
شەوەکان و ئارەزووەکان و تامەزرۆییەکانی تۆ
منیش دێم و لەنێو تۆدا
سەر بەسینگی مانگ دەکەم
خۆم و منداڵیم و خۆم و شیعر
خۆم و باخچەیەک پڕ لە هەتاوی نیشتیمانە غەریبەکەم
لە ماڵەکەت دەمێنمەوە
ڕۆژئاوابوونەکانی نێو ڕووتبوونەوە و
سپیدە ڕوون ڕوونەکانی مردن و

وەرزەکانی نێو تەنیاییمان دەژمێرم
لەنێو تۆدا
لە بنار مەمکۆڵەکانی مانگ
بە تەنیا
لەسبەینێی ڕۆژە تاکەکانی تەمەنم و
شەوە ڕووتەکانی نێو ئەلبوومی
ڕووتبوونەوەی تۆ و ئایندەی خۆم دەڕوانم .

**بەفرانباری ٢٠٠٨**

# سروودێک لە بناری قەندیلەوە

هەر لێرەوە
لە بناری ئەم چیایە سەرکەشەوە
لەنێو چاوەکانی بەفر و
هەناسەکانی هەور و
سەماکانی خۆرەتاوەوە
دوور دوور
بڵند بڵند
ورد ورد ... بڕوانن
هەر لێرەوە
لە بناری ئەم چیایە سەرکەشەوە
لەنیو نیگاکانی بەفر و

ڕۆحە بێگەردەکانی باڵندەوە
سروودێکم دێتە گوێ و پێم دەڵێ
لێرە مەرگ باوەشی بۆ ژیان کردۆتەوە
لێرە ژیان باوەشی بۆ ئایندە کردۆتەوە
لێرە ئایندە باوەشی بۆ ئازادی کردۆتەوە
هەر لێرەوە
لەبناری ئەم چیایە سەرکەشەوە
لەنێو چاوەکانی بەفر و
لەنێو نیگا گەرمەکانی خۆرەتاوەوە
نیشتیمانێک دەبینم
سەوزتر لە باخچەکانی بەهەشت و
ڕەنگینتر لە بەهەشتەکانی خودا و
بەرینتر لە ئۆقیانووسەکانی خەون
هەر لێرەوە
لەبناری ئەم نیشتیمانە سەوزەوە

مەرگ گۆرانی بۆ ژیان دەڵێ
ژیان گۆرانی بۆ ئایندە دەڵێ
ئایندە گۆرانی بۆ ئازادی دەڵێ
هەر لێرەوە
لە بناری ئەم چیایە سەرکەشەوە
پەلکەزێڕینەی ئاسمانەکانی خۆرەتاو
لەسەر پشتی شەپۆلەکانی ئومێدەوە
ڕەشەباکانی مەرگ و
بروسکەکانی تاریکی ڕاودەنێن
لە دووری دوورەوە ،
بە دەم ڕەهێڵەی باران و تۆفانەوە
سروودێکم دێتە گوێ و پێم دەڵێ
ئێرە نیشتیمانی
خەونە سپییەکانی پەپوولەیە
ئێرە نیشتیمانی

باران و گیا و گەڵا و گوڵ و وەنەوشەیە
ئێرە نیشتیمانی
زەردەخەنە و ڕازەکانی ئەستێرەیە
لێرە بەفر سەما بۆ خۆرەتاو دەکا
لێرە خۆرەتاو عەشق لەگەڵ ژیان دەکا
لێرە ژیان باخچەکانی ئایندە ئاو دەدا
لێرە ئایندە گۆناکانی ئازادی ماچ دەکا
هەر لێرەوە
لە بناری ئەم چیایە سەرکەشەوە
لە نێو کەڤاڵەکانی
مردن و لە دایکبوون و بەرخودانەوە
پێنج هەزار باڵندەی باڵنەخشین و
( سەد و هەشتا و دوو هەزار ) پەپوولەی سپی و
پەنجا ملیۆن مرۆڤی بێ نیشتیمان
لە نێو سرووودەکانی خاک و بەفر

هەموو تێکڕا
هاوار دەکەن و دەڵێن
هەر لێرەوە
لە بناری ئەم چیایە سەرکەشەوە
لە باوەشی ئەم نیشتیمانە سەوزەوە
یان ( هەموومان بەیەکەوە دەمرین )
یان هەموومان بەیەکەوە
لە نێو نیگای خەونە سپییەکانمانەوە
گۆرانی
بۆ ژیان و بۆ ئایندە و
بۆ خۆرەتاوی ئازادی دەڵێینەوە ... !

**٢٩ی فێبروەری ٢٠٠٨**

# وردیلە شیعر

**- هەناسەی مەرگێکی پێخواس**

لە بیرمایە
لە شەوێکی تاریک هاتمە دنیا
لە ژوورێکی چاو بە فرمێسکی پڕ لە نهێنی
یەکەمجار کە چاوم هەڵێنا
چاوم بە زەردەخەنەی
سەر ڕوخساری فانۆسێک کەوت
بەبێ ئەوەی بزانم
مانای / ڕووناکی و زەردەخەنە چییە
هیچ لە نهێنیەکانیش تێنەدەگەیشتم

لەو شەوە
لەنێو هەناسەی مەرگێکی پێخواس
بەدوای
نهێنیەکانی ژوورە تاریکەکە و
زەردەخەنەکانی سەر ڕووخساری فانۆسەکە و
ڕووناکی نێو بێدەنگی و تەنهاییەکانی
خۆم دا دەگەڕێم !

**- قەدەر**
ڕۆژانێک لە نێو ئاوێنەی دڵی تۆدا
نیشتیمانێکم دەبینی
پڕاوپڕ بوو لە باخچەکانی شیعر
لەنێو ئاوێنەی دڵی شیعریش
نیشتیمانێکم دەبینی
پڕاوپڕ بوو لە باڵا ڤینۆسیەکەی تۆ

بەڵام ئێستا
لەنێو ئاوێنەکانی دڵی تۆ و دڵی شیعر
نیشتیمانێک دەبینم
پڕاوپڕە لە مەرگی خۆم !

**- سێبەری شیعر**

تۆ لە سەرەتا
تەنها سێبەری باڵام بوویت
ئێستا ، بووی بە سێبەری
خۆرەتاوی خەیاڵ و
مەرگی سپی شەوان و
بووی بە سێبەری خەون و شیعرەکانیشم !

**- مردن**
گۆشەیەکە لە تەنیایی ... !

**- تەنیایی**
گۆشەیەکە لە مردن ... !

**- ژیان**
خەونێکی ئیرۆسییە و هیچی تر !

**- سەفەر**
فڕینە لەنێو قوولایەکانی ئارەزوو !

**- عەشق**
ئەگەر جارێکی تر لە دایک ببمەوە
ڕەنگە بتوانم
پێناسەیەک بۆ عەشق بکەم !

**- ئەو شەوەی مانگ میوانم دەبێ**

ئەو شەوەی مانگ میوانم دەبێ
لەنێو هەناسەی کاتژمێرەکانی تەنیاییم
دێمە دەرەوە و
مۆمێک بۆ نەوڕەسەکانی جوانی دادەگیرسێنم
ئایەتەکانی ئاوێتەبوون دەنووسمەوە
ئەو شەوە
دەرگا لەکەس ناکەمەوە
گوێ لە پاڕانەوەی ژنە ڕووتەکانی
نێو لاوک و سەمفۆنیاکانی ڕووبار ڕاناگرم
ئەو شەوە
دەرگا لە کەس ناکەمەوە

تا بەیانی
لە باوەش و لەنێو مەمکۆڵەکانی مانگ
دەمێنمەوە !

**- گەڕانەوە**

ئاو گوتی بگەڕێوە
ماڵەکەم بێ تۆ تاریکە
ماسیەکان گوتیان بگەڕێوە
عەشق بەبێ گۆرانییەکانی تۆ
مانایەکی نییە
درەخت و با گوتیان بگەڕێوە
چیتر لەنێو بیابانەکانی تەنیایی
بەرگەی گەردەلوول و ڕەشەبا ناگریت

دایکم گوتی  بگەڕێوە
چیتر بە ئاگری تەنیایی خۆت مەسووتێنە
ئیتر منیش بڕیارم دا
بگەڕێمەوە نێو ماڵەکەی ئاو
بۆ هەتا هەتایەش
هەر لەوێدا بمێنمەوە

**نیسانی ٢٠٠٨**

# گەڕان بە دوای خۆرئاوابوونێکی سپی

من لێرەوە هاتووم
بەنێو خەرەندە تاریکەکانی خۆرەتاو
من لێرەوە لەدایک بووم
لە نێو ژوورێکی تاریکی پڕ لە گومان
من لێرەوە یاخیم
دوور لە چاوە سەوزەکانی ئاو
من لێرەوە ونم
دوور لە هەناسە بێگەردەکانی پەپوولە
من هاتووم و لە نێو گەڕانەکانم دا
بەدوای عەشقێک دا دەگەڕێم
عەشق وەک خۆی

لە نێو پایزی ڕوانینەکانم دا
بەدوای جوانیەک دا دەگەڕێم
جوانی وەک خۆی
لە نێو خەونە خۆڵەمێشیەکانم دا
بە دوای مردنێک دا دەگەڕێم
مردن وەک خۆی
من لێرەوە هاتووم
لەنێو کەڤاڵە ڕەنگاوڕەنگەکانی عەشق
من لێرەوە لە دایک بووم
لە نێو ژوورە بخووریەکانی جوانی
من لێرەوە سەما دەکەم
لە نێو تابلۆی باخچەکانی مردن
من هاتووم و
بەدوای سروشتێک دا دەگەڕێم
دەستکردی هیچ خودایەک نەبێت

گەڵا و گوڵ و ڕەنگەکانی
سەما بۆ مەستبوونەکانی مرۆڤ بکەن
من هاتووم و گەرەکمە چیتر
لە فرمێسکەکانی خاڵخاڵۆکە ڕانەمێنم
لە یاخیبوونەکانی مانگەشەو و
لە ونبوونەکانی شەونم ورد نەبمەوە
من هاتووم و گەرەکمە
فانۆسەکانی نێو ماڵی خەیاڵم
بخووری نێو دەلاقەی ئارەزووەکانم ، داگیرسێنمەوە
من هاتووم و چیتر نامەوێ
بە سەوڵێکی شکاوەوە
خۆم بدەمە دەست دەریاچە قووڵەکانی قەدەر
گەرەکمە تەوقی گەردنی هاوارەکانم
لە بەردەم دەرگای پەرستگای ڕووناکی تووڕ هەڵبدەم
من هاتووم و چیتر نامەوێ

لە نێو دۆزەخێکی تاریک
بە دیار مەرگی کتێبەکانمەوە
وەکو باران
بڕژێمە نێو جۆگەلەکانی ئایەت و لاوکەکانی خورافیات
گەرەکمە چیتر
لە نێو سەدەفی بێدەنگبوونی خاک و
لە نێو بێشکەی وەرسبوونەکانی بەفر نەمێنمەوە
هاتووم و
هەموو شەقامە گیاییەکانی نێو باخچەی غەریزەکانم گەڕاوم
بەنێو پارک و کەنار دەریا و باخ و بیابانەکانی خەون و خەیاڵەکانم گەڕاوم
شەو و شەوگار و وەرز و سەدەکانی نێو ناوەوەی خۆم گەڕاوم
کوچە و کۆڵان و گەڕەک و پێدەشتەکانی منداڵیم گەڕاوم
بەنێو خەمە سپیەکانی نێو پرچ و چاوە گەشەکانی دایکیشم گەڕاوم
بەنێو ئێوارە ڕۆمانسیەکانی باران و
شەوە شینە شلێریەکانی ئاویش گەڕاوم

بە نێو دۆڵ بە دۆڵ و شاخ بە شاخ و ئاسمانە سوورەکانی ئەستێرانیش گەڕاوم
بە نێو ئۆقیانووسی ئایەت بە ئایەتی کتێبە خوداییەکانیش گەڕاوم
بەنێو خەونە ئیرۆسییەکانی فرۆید و ڕوخسارە خەماوییە
مرۆڤە پەتاتە خۆرەکانی نێو تابلۆ و فیگەرەکانی ڤانکوخیش گەڕاوم
بەنێو بست بە بستی کیشوەر و دەریا شەهوەتاوییەکەی / نێو کەللەسەری
پاشا و میر و گەدا و کوێخا و جەلادەکانیش گەڕاوم
لە نێو هەموو گەڕانەکانم دا ، ئەوەی بینیم
ئاوەدانیەکی گرمۆڵەی سەرخۆش و وەرزێکی نامۆی خەواڵوو و
چەند کەرنەڤاڵێکی خوێناوی و هیچی تر
هیچ و هیچ و هیچ ...
نەمبینی / شیعرێکی چاو بەخوماری نێو کتێبەکانی عەشقم نەبینی
عەشق وەک خۆی
نەمبینی / ڕووناکیەکی نێو پەرستگە چراخانیەکانی جوانیم نەبینی
جوانی وەک خۆی
نەمبینی / بزەیەکی گەرمی نێو هەناسە نوورانیەکانی مردنم نەبینی

مردن وەک خۆی .
جەخار ، سروشت منی دەسخەڕۆ برد
لەم هاتنەم پەشیمانم
ئەم گۆی زەوییە جێگەی پشوودانی من نییە
ئەم ئاسمانە جێگەی فڕینەکانی من نییە
ئەم دەریاچەیە جێگەی باسکەمەلەکانی من نییە
دەڕۆم و ماندوو تر لەجاران
بەدوای جیهانێکی تردا دەگەڕێم
کە پڕاوپڕ بێ لە ڕووبەرەکانی خەون
بە دوای ئەو وەرزانە دا دەگەڕێم
کە پڕاوپڕن لە ڕوانینە دۆلفینیەکانی ئاو
بەدوای ئەو بەهەشتەدا دەگەڕێم
کە پڕاوپڕە لە خۆرئاوابوونە سپییەکانی خۆشەویستی
بم بەخشن ئەمجارەیان
خۆم بە حیکمەتی گەمە بێ ئاگاییەکانم ناسپێرم

بە دوعای نەوڕەسە لانەوازەکان و شەپۆلە خەوتووەکان سەما ناکەم
دەڕۆم و ئەمجارەیان گەرەکمە
بە گزنگی سەر ڕوخساری شالوورە شادومانیەکانی عەشق بگەم
عەشق وەک خۆی
دەڕۆم و ئەمجارەیان گەرەکمە
بە بروسکە و هەورە سپیە پایزییەکانی نێو ئاسمانی جوانی بگەم
جوانی وەک خۆی
دەڕۆم و ئەمجارەیان گەرەکمە
بە دارستانە پڕ لە دار زەیتوونە سەوز سەوزەکانی مردن بگەم
مردن وەک خۆی
لە نێو سەفەر و گەڕانەکانم دا
میوەجاتی هەموو باغاتێکم خوارد
هەموو بیابانێک و دڕکەلانێکم بڕی
هەموو دیوانە ئەفسانەییەکانی گەردەلوولم خوێندەوە
وەک ئەشقیایەکی سەرشێت بە هەموو زمانێک گۆرانیم گوت

بە نێو شەقامی هەموو ئێوارانێک دا پیاسەم کرد
هەموو جۆرە شەڕابێکم هەڵدا و سەمام بۆ هەموو شنەبایەک کرد
بووم بە هەمبانەی هەموو هیوایەک
بووم بە بارانی هەموو بەهەشتێک
بووم بە شاسواری هەموو شاژنێک
بووم بە ئاگری هەموو ئافاتێک
لە نێو سەفەر و
گەڕانەکانم دا
لە هەموو کانیەک قومە ئاوێکم خواردەوە
لە شەوژووانی هەموو کچێک ڕۆژم کردەوە
لەژێر سێبەری هەموو درەختێک سەرخەوێکم شکاند
بە هەموو ڕەنگێک نیگاری ئومێدەکانی خۆمم ڕەنگ کرد
ئەوپەڕی سنوور و تخوبەکانی ونبوونم بڕی
بووم بە خڕخاڵی هەموو خولیایەک
بووم بە پاوانی هەموو پێدەشتێک

بووم بە کانیاوی هەموو کۆسارێک
بووم بە ڕازیانەی هەرهەموو ڕازێک
لە ڕێگادا
لە نێو سەفەر و گەڕانەکانم دا
ئەو گەڵایانەم بینی
گوڕ گوڕ دەبوونە گەردانەی گەردنی گومان
ئەو پەڕەسێلکانەم بینی
پەڕ پەڕ پەڕی کتێبە پیرۆزەکانیان بۆم هەڵدەدایەوە
هیچترین چیرۆکەکانی ( هیچ )یان بۆم دەخوێندەوە
هیچ و هیچ و هیچ ...
لە نێو هەموو سەفەر و گەڕانەکانم دا
شمشاڵێکم نەدۆزییەوە
پڕ بە گەرووم سەمفۆنیای عەشقێکی پێ بژەنم
عەشق وەک خۆی
دەریایەکم نەدۆزییەوە ، مرواریيەکانی جوان بن
جوانی وەک خۆی

باخچەیەکم نەدۆزییەوە ، گوڵەکانی هێندە سپی بن
بچەمێنەوە بۆ سپیترین کەژاوەکانی مردن
مردن وەک خۆی !

**ئایاری ٢٠٠٨**

# شەوێک لە دۆزەخ دا

## ١

سەفەرێک لەو سەفەرانەی
بەدوای خۆمدا دەگەڕام
خۆم لە خۆم ون ببووم
خەونەکانم لێ ون ببوون
منداڵیم لێ ون ببوو
بەدوای خۆم و منداڵیم دەگەڕام
بەدوای زەردەخەنەکانی سەرسیما و
وشە فێنکەکانی عەشق
لەنێو ونبوونی

خۆم و منداڵیم و خەونەکانم دا
دەرگای غەریزە چەپێندراوەکانم بەسەردا داخرابوو
پەنجەرەکانی هەستە بێئاگاییەکانم
ژەنگیان هەڵێنا بوو نەدەکرانەوە
هێندەی دەمکرد
نەمدەتوانی گوڵ و پەپوولەکانی ناوەوەی خۆم
وەقسە بهێنمەوە
خۆم لە نێو خۆم دا
تابلۆیەکی نامۆ و پڕ لە ڕەنگی پەرش و بڵاو بووم
خۆم لەنێو خۆمدا
کاتژمێرێکی حەپەساو بووم
لەنێو ئۆقیانووسەکانی زەمەن
مانگێکی سەرگەردان بووم
لەنێو بیابانەکانی شەو
خاچێکی داتاشراو بووم

بە قەد دیوارەکانی چارەنووس
دەگەڕام و
لەنێو شەوەکانم
مۆمێکم پێ نەبوو بۆ بینین
وشە و ئاوازێکم پێ نەبوو بۆ گۆرانی
دەگەڕام و ببووم
بە نیشتمانێکی تاریک
گەڕەک و شەقام و ڕێگاوبانێکی تاریک
ڕۆحم / جەستەم / ناخم
نامۆ بوون بە ڕووناکی
دەگەڕام و ببووم
بە کیشوەرێکی بێناونیشان
بە دەریاچەیەکی خەوتوو
بە سروشتێکی یاخی
دەگەڕام و دەگەڕام و دەگەڕام

خۆم لەنێو گۆڕستانێک دا بینیەوە
گۆڕستانێکی تاریک تاریک
لەوێندەرێ
مرۆڤەکان بە مردوویی
پیاسەیان دەکرد و گۆرانیان دەگوت
شەپۆلەکانی دەریا بە مردوویی دەڕۆیشتن
باڵندەکان بە مردوویی دەفڕین
باران بە مردوویی مەمکەکانی گیای ماچ دەکرد
هەموو شتەکان مردوو بوون
کاتژمێرەکان / وەرزەکان / سەدەکان / ڕووبارەکان
باخچەکان / شەقامەکان
لەوێدا
لەنێو ئەم گۆڕستانە تاریکەدا
منداڵی خۆمم دۆزییەوە
لەنێو ماڵێکی تاریکی نێوگەڕەکی مردووەکان بوو

بەڵام
هێندەی بەدوای خۆمدا گەڕام
خۆمم نەدۆزییەوە
هێندەی بەدوای ڕووناکی دا گەڕام
ڕووناکیم نە دۆزییەوە
هێندەی بەدوای زمانێک دا گەڕام
تا قسە لەگەڵ خۆم و مردووەکان دا بکەم
هیچ وشەیەکم
نەدۆزییەوە ... !

٢

سەفەرێک لەو سەفەرانەی
بەدوای خۆمدا دەگەڕام
خۆم لە خۆم ون ببووم

شەوێکیان
ڕێمکەوتە دورگەکانی دۆزەخ
وەکو ئاگر
لەنێو شەقامەکانی ڕووناکیدا
کلّپەم دەکرد
لەژێر کەپرێکی پڕ لە گەڵا لێی ڕاکشام
ژنێکی ناسکۆڵە و جوان
وەک نەمامە بڵێسەییەکانی هەتاو
وەک سروشتە بەهەشتیەکەی
نێو چاوەکانی خودا
خۆی خزاندە نێو جێگاکەم
هەڵم لە چاوەکان و
لە پەنجەکان و لە کانیەکانی ڕۆحم هەڵدەستا
ماچەکانی پڕ بوون لە بەفر
گۆنا و دڵ و سیماکانمی فێنک دەکردەوە

لەژێر ئاسمانێکی شینی ئاوریشمینی
لەگەڵ
ڕەنگەکان و سەمفۆنیاکانی ئەڤینی
تا بەیانی
نەرم نەرم دەیشێلام
دەیشێلام و نەرم نەرم
چیرۆکی وەرزەکانی نێو دۆزەخی خۆی
بۆ دەگێڕامەوە
دەیشێلام و نەرم نەرم ، ئاوێزانم ببوو
وەک ئاوێزانبوونی بەفر و گەڵا
ئاوێزانم ببوو
هەموو جەستەم ببوو بە مەشخەڵێکی شین شین
بە ماچ
وەڵامی ڕوانینەکانم و پرسیارەکانمی دەدایەوە
بە ماچ

سەمای بۆ نیگەرانیەکانی نێو چاوەکانم دەکرد
ئەو پرسیار و نیگەرانیانەی
جەستە و ڕۆح و وێنەی خودێکی سەرشێت و ونی
ڕەسم دەکرد
ئەو پرسیارانەی نامۆ بوون
بە تخوبەکانی کات و
بە کتێبە ڕۆشناییەکانی شەو
بە مەرگی کۆڵانە ئاوێنەییەکانی خەون
ئەو پرسیارانەی پڕاوپڕبوون
لەسەفەر و گەڕان بەدوای خودێکی ون
پڕاوپڕ بوون
لە مەستبوونەکانی ئاو
لە سەمای مانگە شەوەکانی خۆکوشتن
ماچ ماچ ماچ ماچ ماچ
ئەوە چ دۆزەخێکی

ئیرۆسی و ئەڤینی و سیحراوییە ئەی خودا
کە مەوداکانی لە دایکبوونەوە و فڕینەکانم
پڕ دەکات لە باران
ئەوە چ جووتە مەمکێکی لیمۆییە ئەی خودا
کە دەمارەکانی ڕۆحم و
نێو دەمم پڕ دەکات لە لیک
لیک لیک لیک لیک لیک
من لە مەودوا
وەک خودێکی ون و یاخی
وەک عاشقێکی سەوداسەر
دۆزەخ دەکەم بە ماڵم و بەهەشتیش بە جێگەی ژووان
هەر ئەو شەوە
ئەو شۆخە ژنەی تابەیانی نەیهێشت
بۆ یەک چرکەش
چاوەکانم بچنە خەو

بەر لە ڕۆیشتن
زەردەخەنەکانی خۆی
وەک چەند ماسیەکی وردیلە
لەنێو لیکی نێو دەمم
ماچەکانی لەنێو نیشتیمانی هەناسە و
مەمکەکانی لە نێو
باخچەکانی تەنیاییم / جێهێشت ... !

**ئایاری ٢٠٠٨**

# نیگارەکانی بەرد

## ١

مەم و زین
کتێبێکە لە بەرد
مێژووی بەرد و
مرۆڤەکانی چارخی بەردینمان
بۆ دەگێڕێتەوە

٢

ئەدیسۆن
چاوی بە جوانییەکانی بەرد هەڵنەدەهات
بۆیە چرا بەردینەکانی
نێو ماڵ و باخچە و ڕۆحی بەردی
کوژاندەوە

٣

پیکاسۆ
عاشقی نەخشە بەردینیەکانی ئەفەریقا بوو
بۆیە بوو بەتاقە نیگارکێشی سەدەی بیستەم

٤

مارکس
فەیلەسووفێک بوو
هەمیشە فرمێسکەکانی بەردی دەنووسییەوە
بۆیە کە مرد
لە گۆرستانی ( هایگەیت )
پەیکەرێکیان لەبەرد بۆ دروست کرد

٥

خوداکانی یۆنان
دوای مردنی نەرسیسەس
یەکبەدوای یەک هەموویان بوون بە بەرد

## ٦

مرۆڤە بەردینیەکانی بەهەشت
دڵیان تەڕ و ڕۆحیان فێنک بوو
جەستەیان ڕەنگا و ڕەنگە
وەک بەردەکانی نێو ئاو

## ٧

ئەهرامەکانی میسر
کۆمەڵە نیگارێکن پڕاوپڕن
لە کۆدەکانی بە نەمربوونی بەرد
ئەوە قسەی یەکێک لە خودایە بەردینیەکان بوو

٨

بەر لە زوحاک ماری حەوتسەر هەبوو
مرۆڤیان قووت دەدا
لە ئەشکەوتەکانی ئەم سەردەمەش
ماری دووسەر هەیە
مرۆڤەکان لە بەردەمیان دەچەمێنەوە و
دەبن بە بەرد !

٩

بتهۆڤن
بۆ سەمای بەرد
مۆسیقای دەژەنی
بۆیە بوو بە بەشێک لە مێژووی بەرد

١٠

میکیاڤیلی
لەسەر شمشێرە بەردینیەکان
بیردۆزەکانی شەڕ و
ماناکانی شەڕی ڕەسم کرد

١١

گالیلۆش
بە تەلیسکۆبێکی بەردینەوە
لە بازنەکانی سووڕانەوەی
زەوی و خۆر و مانگ و
هەموو ئەستێرەکانی تری دەڕوانی .

## ١٢

منیش / ژنەکانی بەرد
فێرە عەشقیان کردم
مەمکەکانی بەرد
فێرە شیعریان کردم
تاڤگەکانی بەرد
فێرە گۆرانیان کردم
قەڵەمەکانی بەرد
فێرە یاخیبوونیان کردم

## ١٣

منیش / لەنێو لاوکەکانی بەرد
ڕابووردووی خۆم دەبینم
لەنێو ڕابووردووی خۆم

زەردەخەنەکانی بەرد دەبینم
لەنێو زەردەخەنەکانی بەردیش
مردنی خۆم دەبینم !

## ١٤

ئەودەمانەی
دڵم پڕ دەبێت لە مەراق و
بەقەد بەرینایی دەریاچەکانی عەشق
هیچ تروسکاییەک نابینم
حەزدەکەم وەکو ( چیخۆف )
قسە بۆ ئەسپێکی بەردین بکەم
لەنێو وەرزەکانی فرمێسکیشم
خۆم بە کۆڵارە بەردینیەکان هەڵبواسم

## ١٥

من هەمیشە
خەون بەو ڕۆژەوە دەبینم
بگەڕێمەوە نێو پەرستگە بەردینیەکان
بەدیار پەیکەرەکانی عەشق
سەماکانمان دابەستینەوە
بەڕەهایی پێکە شەڕابیەکانی خۆشەویستی هەڵبدەین
هەر لەوێدا
لە جوانیە بەنەفسەجیەکانی ژیان و
لە بەها پیرۆزەکانی بەردیش ڕابمێنین !

**حوزەیرانی ٢٠٠٨**

# شەوێک لە ناوەڕاستی مانگی جۆزەردان دا

شەوێکی تاریک
وەک تاریکە قەترانییەکانی
نێو وەهمە دۆزەخییەکانی خودا
شەوێکی درێژ
وەک زەریاکان و
ڕێگا هات و نەهاتەکانی مەنفا
شەوێکی یاخی
وەک یاخیبوونە خۆکوژییەکانی ڕەشەبا
شەوێکی بێباک
وەک بێباکیە ئەسمەریەکانی سێبەر
شەوێک لەو شەوە برینداراانەی

کە مانگ بۆ چرکەیەک چاوەکانی ناچێتە خەو
ئەستێرەکان بۆ تەنها جارێک چاوەکانیان ناترووکێنن
هەور لە زیکر کردن دانامرکێتەوە
بروسکە بەیەک هەناسە سروودەکانی دەچڕێ
شەوێکی بێئاگا
لە مردنی تیشک و لەسەرخۆشبوونی کات و لە ونبوونی
سەوزایی و لە خێلبوونی چاوەکانی مێشوولە
لە ڕەشهەڵگەڕانی سەدەفە سپیەکانی شیعر
شەوێک لەو شەوانەی
عەشق دەبێتە هاوکێشەیەکی بێمانا و
ژیان دەبێتە نیگارێکی ئەبستراکتی ڕەش وسپی
وەرزەکان دەبنە پیرەدارێکی بێ گەڵا و
ڕووناکی دەبێتە پەڕەمووچەیەک بە دەم باوە
گۆرانیە عەبەسیەکانمان بۆ دەڵێتەوە
شەوێک لەو شەوانەی

مانگەشەو چیتر یادەوەریەکانی خۆی نانووسێتەوە و
لەنێو بێشکەی مەرگ ڕادەکشێ
شەوێک لەو شەوانەی
ئاگر پێم دەڵێ / دوورکەوە لێـــم چیتر تۆ لە جنسی من نیت
بەفر پێم دەڵێ / چیتر بە نیگاکانی تۆ مەست نابم
شەقام پێم دەڵێ / پیاسەکانی تۆ لە سەرابە نامۆییەکانی سەرسینگم دەچن
شەوێک لەو شەوانەی
خەون و وڕێنە سپییەکانی دایکم لە تەنیشت ماڵەکانی مەرگ
ڕەشماڵەکانیان هەڵدەدەن
لەم شەوەدا
چیتر باران و گیا لەگەڵ یەکتری جووت نابن
چیتر نەوڕەسەکان / نامە پڕ نهێنیەکانی عاشقان ناگەیەنن
چیتر دەلاقەی ژوورەکانمان پڕ ناکەین لە کتێب و شمشاڵ
شەوێک لەو شەوانەی مرۆڤەکان دەبن
بە نافوورە کەسک و سۆرەکانی گوناه و

نیوەی جەستەی من دەبێ بە جەستەی باڵدار و
نیوەکەی تریشم دەبێ بە جەستەی
کچۆڵە کۆچەرییە ڕەنگ خەنەییەکان
ئاسمان نیوەی دەبێ بە هەورە تریشقە و
نیوەکەی تری دەبێ بە تۆز و غوبار
زەریاکان نیوەیان دەبن بە هەڵم و
نیوەکەی تریان دەبێتە پووش و پەڵاش
شەوێک لەو شەوانەی
من بە زمانی ئاگر دەدوێم و
باش بە زمانی ئەهریمەنەکان
لم بە زمانی مەرگ دەدوێ و
گەردەلوولیش بە زمانی فریشتەکان
کەمانجە بە زمانی خۆڵەمێش دەدوێ و
عەشقیش بە زمانی تاریکی
شەوێک لەو شەوانەی

باخچەکانی هەتاو ڕەنگەکانیان لە نێو
کۆڵانەکانی بیابان یەخسیر دەبن
درەختەکانی ئاوەدانی بەنێو کێڵگەکانی پەلکەزێڕینە
گەڵاکانیان سەرخۆش دەبن
کڵۆ بەفرەکان بە ڕووتی لەسەر شۆستەی شەقامەکان
دەمێننەوە
ژنە شۆخەکانی نێو کۆشکە ڕازاوەکانی بەهەشتیش
لەژێر کەپری دارچرووەکانی نائومێدی
خۆیان حەشار دەدەن
شەوێک لەو شەوە بێدارانەی
بێدار بێدار
وەک ڕۆحی من و هەناسەکانی مانگ
وەک چاوەکانی ڕووبار و جەستەی شەقام
ئەو شەوە هەموومان
سمۆرەیەکی بێدار بووین

لەنێو دارستانێکی بێداردا
هەمووماン
وەک کچێنیە بێدارەکەی حەوا پڕ بووین لە گومان و
وەک کوڕێنیە کارێزماییەکەی ئادەمیش پڕ بووین لە تاوان
لەم شەوەدا .. ساویلکانە
فریشتەکانی سەرشانی خۆمانمان کوشت
بخوورەکانی نێو خەیاڵ و خەونە سپیەکانی خۆمانمان
کوژاندەوە
مەرەزە وشکهەڵاتووەکانی تەمەنمان بە خوێن تەڕ کردەوە
شەوێک لەو شەوانەی
هەموو چیرۆکەکان و ڕۆمانەکان و داستان و
ئەفسانە و بەسەرهاتەکان
بە دابڕان و مردن کۆتاییان دەهات و
هەموو ئافاتەکان و کۆچ و جەنگ و هەرەس و وێرانبوونەکان
یەک بەدوای یەک دووبارە دەبوونەوە

هەموو گۆڕستانەکان و گۆڕە بە کۆمەڵەکان و دۆڵ و
خەرەند و چاڵەکانیش
ڕووبارەکانیان بەرینتر و بەرینتر دەبوونەوە
ئای کە مێژوویەکی خوێناوی و کیشوەرێکی بورکانی و قەدەرێکی نابینا و
خۆرهەڵاتییەکی بریندار بوو ئەم شەوە ... !

**جۆزەردانی ٢٠٠٨**

# ونبوون

کاتێک ئاو
لەنێو سێبەری خۆیدا ون دەبێ
پەپوولەکانی بەرائەت
بەدوای پەرستگەیەک دا دەگەڕێن
تا لەوێدا
لەبەرامبەر خودای جوانی
بچەمێنەوە و دوعاکانیان بخوێنن !

کاتێک مانگ
لەنێو ڕووناکیەکانی خۆیدا ون دەبێ
هەورە سپیەکانی بەرائەت

دەڕژێنە نێو شەقامە بێدەنگییەکانی درەخت
نیگارێک بۆ ئاوێتەبوون دەکێشن

کاتێک خۆرەتاو
لەنێو شەوەکانی خۆیدا ون دەبێ
کاتژمێرە شینەکانی مێژوو
لەنێو بالکۆنە تەنهاییەکانی ئاگر
مۆمێک بۆ لە دایکبوونەوەی بروسکە
دادەگیرسێنن !

کاتێک گەردەلوول
لەنێو کۆڵانە تاریکەکانی لم دا ون دەبێ
باڵندەکانی بەرائەت
لەنێو ئەشکەوتە شووشەبەندەکانی بەفر

دەمێننەوەو
سروودێک بۆ پشکۆی وەرزەکانی گوناه
دەنووسنەوە

کاتێک منیش
لەنێو خەیاڵە پایزیەکانی غوربەتم ون دەبم
نیشتیمانێک
پڕ لە شەپۆلە بەرائەتییەکانی یادەوەری
لەنێو کەژاوە پەمەییەکانی عەشق
دێت و خەونەکانم پڕ دەکات لە باران و
ڕۆحم پڕ دەکات لە ماچ !

# ماچ

## بەشی یەکەم

گوڵەگیان
ئەی خوداوەندی عەشق و جوانی
ئەی چرکەساتە پەنهانییەکەی
ژێر کەپرەکانی ژووان و دەسلەملانێ و
ڕامووسانی
ئەی ڕوخسارە زێڕینییەکەی
زەردەپەڕی ئومێدەکان و ئاوەدانی
هەرچۆنێک ئارەزوودەکەی
تۆ دەتوانی ماچم بکەی
ئەوکاتانەی
بیر لە خۆکوشتن و مردنم دەکەمەوە

یان ئەوکاتانەی
دەمەوێت لەگەڵ تۆدا بخەوم
یان ئەو دەمانەی
دەمەوێت لەگەڵ نیگەرانییەکانی خۆمدا جووت بم
لەهەرکاتێک
هەرچۆنێک ئارەزوو دەکەی
تۆ دەتوانی ماچم بکەی
لە بنار دیوانی شیعرێکم
لە بالکۆنێکی خەونەکانم
لە کۆڵانێکی یادەوەریم
لە ئاقارێکی خەیاڵم
لەنێو تابلۆیەکی لە دایکبوونەوەم
لەنێو باخچەیەکی ژیانەوەم
لەسەر پشتی شەپۆلێکی هەستانەوەم
لە هەر شوێنێک

هەر چۆنێک ئارەزوودەکەی
تۆ دەتوانی ماچم بکەی
من ڕێبوارە ماندوەکەی
نێو مەمکۆڵەکانی تۆم
من موریدە خوداییەکەی فیردەوسی
نێو چاوەکانی تۆم
من شۆڕەسوارە ئاوییەکەی ئۆقیانووسی
نێو فرمێسکەکانی تۆم
من تاسەو ختووکە چووزەرە ڕێواسییەکانی
نێو جێگای شەوەکانی تۆم
هەر چۆنێک ئارەزوودەکەی
تۆ دەتوانی ماچم بکەی
ئەوکاتانەی
گوێ لە سەمفۆنیای کچێنی تۆ ڕادەگرم
یان کوڕێنی خۆمت بە ئیمەیلێک بۆ دەنێرم

یان ئەو دەمەی
لەنێو نیگاری ڕووتبوونەوەی گوڵ
نامەیەکت بۆ دەنووسم
یان /
دەگەڕێمەوە سەر شیعرە زایەندییە
تەواوِ نەکراوەکانم
یان ئەو دەمەو سەحەرانەی
سەرچڵانە و مەست مەست
لەنێو قیبلەگا و پەناگەی ماچ دا
لە جەستە ڕهونەقدارە ڕووتەکەی
تۆی عاشقم ڕادەمێنم
لە هەرکاتێک
هەرچۆنێک ئارەزوودەکەی
تۆ دەتوانی ماچم بکەی
ئەوکاتانەی کە مردیشم

چ لە نێو ئەلبوومە ئاوریشمییەکەی شیعر
چ لەنێو شەقامە فێنکەکانی گیا
چ لەنێو تیاترۆخانەکانی بەهەشت
چ لەنێو میترۆکانی خەون
لە هەر جێگایەک منت بینیەوە
لەکاتی مەستبوون و سەما کردنم
یان لەکاتی نغرۆبوون و پیاسەکردنم
لە هەرکاتێک لە هەر شوێنێک
هەر چۆنێک ئارەزوودەکەی
تۆ دەتوانی ماچم بکەی
تۆ ڤینۆسی و
من سەرسامی جوانیەکانی تۆم
ئەفرۆدیتەیت و
من سەرسامی خۆشەویستی تۆم
تۆ سروشتی و

من سەرسامی ڕەنگەکانی تۆم
تۆ بارانی و
من سەرسامی ڕۆمانسیەتی تۆم
تۆ خۆت سەرپشک بە گوڵم
هەر چۆنێک ئارەزوو دەکەیت
تۆ دەتوانی ماچم بکەی .
ئەوکاتانەی
بەنێو ئاسمانە وەهمیەکەی ئاگردا ڕەت دەبم
یان گوێ لە هاژە بەسۆزەکەی
ڕەنگە سیحراویەکەی تۆ ڕادەگرم
یان لەنێو شەوە سوورەکاندا
لەنێو کەژاوە پرتەقالیەکانی پاییز دەمێنمەوە
یان لەنێو کاتژمێرەکانی تەنیاییم
کتێبەکانی بێدەنگی دەخوێنمەوە
لەهەرکاتێک

تۆ دەتوانی لە دەرگای دڵم بدەیت و
هەرچۆنێک ئارەزوو دەکەی
تۆ دەتوانی ماچم بکەی
ئەوکاتانەی
وەرزەکان لێم جیا دەبنەوە
وشە خۆڵەمێشیەکانی هەتاو
چیتر لە نێو گومان و
خەیاڵە سەرابیەکانی مندا
نامێننەوە
یان رێژنە تەرزەکانی بەهار
گوێ لە میلۆدی
دەمەو ئێوارانی من راناگرن
خۆرنشینەکانی قەدەر
چیرۆکەکانی لێکدابرانم بۆ دەخوێننەوە
یان ئەو شەوانەی بەخوێنی

نێو ڕۆحی ئەستێرەکانی ئەڤینی
ناولەپی تریفە یاخیبووەکانی خۆم
سوور سوور دەکەم
یان ئەو دەمانەی بەچرای موعجیزەکانی جوانی
بەدوای فیردەوسە سەوزەکانی عەشق دا دەگەڕێم
لە هەرکاتێک لە هەرشوێنێک
تۆ خۆت سەرپشک بە گوڵم
هەر چۆنێک ئارەزوودەکەی
تۆ دەتوانی ماچم بکەی !

**پووشپەڕی ٢٠٠٨**

# ماچ

## بەشی دووەم

گوڵەگیان
ئەو دەمانەی
لەنێو ئەشکەوتەکانی ئاو
خودای میهرەبانی و جوانی
ئایەتەکانی عەشقم بۆ دەنێرێتە خوارەوە
تۆش وەرە و
دوای خوێندنەوەی ئایەتەکان
زاهیدانە لەسەر بەرماڵەکەی شیعر
لەگەڵما ڕابکشێ و ئاوێتەم بە
لە ڕووتبوونەوەی نیگاکانم ڕامێنێ و ئاوێتەم بە

لە نەر مەسەمای گوڵەکانی لێوم ڕامێنێ و ئاوێتەم بە
ئاوێتەم بە تاکو منیش تا ئەوپەڕی تامەزرۆییم
هەموو شوێنێکت ماچ بکەم
ئەو بەیانیەی
تێکەڵ بە شکۆفەی با دەبم
دێم و پەنجەرەی ژوورەکەتم بۆ بکەرەوە
دێم و تێکەڵ بە ڕەنگە خەنەییەکەی
قژی خاوت دەبم
تێکەڵ بە ڕەنگی ژێرکراس و ستیانەکەت دەبم
تۆش ببە بە مەریەمی خودا
تاکو منیش وەکو تیشک
بەنێو جۆگەلەی زایەندیت
بێمە نێو جەستە و بێمە نێو ڕۆحی ڕووتتەوە
فریشتەکانی ئارەزووت بهێنمە سەما
تۆش هەر لەم دەمەدا

ژێرکراس و ستیانەکەت
ببەخشە بە با
گوڵم منیش هەر لەوێدا
لەنێو جێگاو لەنێو ڕۆح و لەنێو تۆدا
دەمێنمەوە
دەمێنمەوە و تا ئەوپەڕی تامەزرۆییم
ماچت دەکەم و هەموو جەستەت دەلێسمەوە

گوڵەگیان
ئەو وەرزانەی منت لێ ون دەبێت
بگەڕێ بەدوام
مێیینەی بەهار لە کوێ بێت من لەوێم
نیشتیمان لە کوێ بێت من لەوێم
قەڵەم لە کوێ بێت من لەوێم
یاخیبوون لە کوێ بێت من لەوێم

عەشق لە کوێ بێت من لەوێم
بگەڕێ بەدوام
بیابان لە کوێ بێت من لەوێنیم
کۆشک و سەرای پاشاکان لە کوێبن من لەوێنیم
بەهەشت لە کوێبێت من لەوێنیم
غوربەت لە کوێبێت من لەوێنیم
زەماوەند لە کوێبێت من لەوێنیم
من لێرانەم لەژێر پیرە دارهەنجیرێکی
گەڕەکە عەشقنشینەکانی پایز
لەنێو چاوە ئەسمەریەکانی سێبەر ڕاکشاوم
من لێرانەم لە چاوەڕوانی تۆدا
خەمە ماسۆشیەکانی مانگ دەنووسمەوە
لەچاوەڕوانی تۆدا
تێکەڵ بەڕەنگە خامۆشیەکانی خاک دەبم
تۆش وەرە و لە تەکما ڕابکشێ

تێکەڵ بە برینەکانی ڕۆحم بە
تاکو منیش
تا ترۆپکی دوندەکانی ئاویزانبوون
لە بنی پێیەکانتەوە
تا تەوقی سەرت ماچت بکەم
ئەوە تۆ لە کوێیت گوڵی من
لە هەر کوێبیت
لە کەناری هەر شەوگارێک
لەبن پردی هەر کیشوەرێک
لەنێو کەژاوەی هەر کازێوەیەک
ئەوە ڕووباری خەمەکانی تۆیە
بەنێو مندا ڕهت دەبن
ئەوە ڕەنگی ماچ و لێوەکانی تۆیە
چاوەکانی من ڕەنگ دەکەن
ئەوە نیگای شەپۆلە یاخیبووەکانی عەشقی تۆیە

ئایندەی من دەخوێننەوە
ئەوە سەدە تاریک و بێ چراکانی نێو نائومێدیەکانی تۆیە
لەنێو تەنیاییەکانی مندا دووبارە دەبنەوە
ئەوە تابلۆی مەرگی من و ونبوونەکانی تۆیە
لەنێو خۆڵەمێشی عەشق دەردەکەون
من لێرانەم
لەنێو خەڵوەتگەی ماچەکانی دوێنێت
لە چاوڕوانی تۆدا
عەشق لەگەڵ مانگ دا دەکەم
لە چاوەڕوانی تۆدا
دەبم بە پەیکەرێک لە ڕووناکی
دەبم بە پەیکەرێک لە درەخت
دەبم بە پەیکەرێک لە ماچ !

**تەمووزی ٢٠٠٨**

# من ئیتر بە چاوەکانی ئاو دەڕوانم

من لە مەودوا
لە نێو خەیاڵ و
لەنێو وڕێنە و وشە و نیگارە شیعرییەکانم دا
بەچاوەکانی ئاو دەڕوانم
نەبادا
سووتانی پەنجەی منداڵێکی نیشتیمانم لە بیر بکەم
نەبادا ،
شەپۆلێک ، هاوارێک ، ڕاسانێک
ژانێک ، گریانێکی
مرۆڤە برسیەکانی نیشتیمانم لە بیر بکەم
نەبادا ،
ونبوونێک ، مردنێک ، دڵتەنگییەکی

عاشقانی نیشتیمانم لەبیر بکەم
نەبادا ،
سەرخۆشبوونی پەپوولەیەک
بێ هۆشبوونی باڵندەیەک
ڕەشهەڵگەڕانی گەڵای درەختێکی نیشتیمانم
لەبیر بکەم
نەبادا ،
چرپەیەک / هەناسەیەک
بزەیەکی سەر ڕوخساری
شەقامێکی پایز و
وەرزەکانی تری نیشتیمانم لە بیر بکەم
نەبادا ، ماسیەکی فەرامۆشکراوی
نێو خەم و ڕووبار و دەریاچەیەکی نیشتیمانم
لە بیر بکەم

نەبادا /
شەوێک لەو شەوانەی
کە مانگ بیر لە خۆکوشتن دەکاتەوە
یان ،
کۆڵانێک لەو کۆڵانە تاریکانەی
نێو ڕۆحە برینا وییەکەی
ئەو ژنانەی
بەر لە چرکەکانی خۆ سووتاندن / لەبیر بکەم
نەبادا /
تابلۆیەک لەو تابلۆیانەی
خوێن و نەفرەت و فۆبیای
نێو نیگا و سیما بەفریناویەکەی
مرۆڤەکانی نێو لم و بیابانەکان ، لەبیر بکەم
من لە مەودوا
لە نێو پیاسە و سەفەر و گەڕانەکانم دا

بە چاوەکانی ئاو دەڕوانم
نەبادا ،
بەفرانبارێک دیار نەمێنێ لە زەمەن دا
باخچەیەک بمرێت لە سروشت دا
ڕەنگێک بریندار بێت
لەنێو ڕووبەرەکانی جوانی دا

نەبادا /
مۆمێک بکوژێتەوە
لەنێو ژوورەکانی
زیکر و تێکئالآن و جووتبووندا
نەبادا /
حەرفێک ، وێنەیەک
بسڕێتەوە
لە نێو دیوانە شیعرییەکانی عەشق دا

نەبادا ،
باران و تاڤگە و قەقنەسەکان
بەفر و خاک و بنجەگیاکان
گۆرانی و ویقارە وەهمیەکانی خۆیانیان
بیربچێتەوە

نەبادا /
شۆڕەبی و شەهلایەک
ڕەیحانە و ڕێواسێک
سنەوبەر و سەوسەنێک
ناز و لەنجە و عیشوە ڕۆژهەڵاتیەکەی خۆیانیان
بیربچێتەوە
نەبادا /
بێدەنگی سپێدەیەک
خنکانی ئێوارەیەک

مەستبوونی درەنگە شەوێک
دەرنەکەوێت لە نێو بازنەی کاتژمێرەکانی
نێو ژوورەکانی غوربەتدا

نەبادا /
بێڕەنگبوونی خوێنی نێو دەمارەکانی ئەستێرە و
بێدرەختبوونی گۆڕستانەکانی نێو مەملەکەتی گەردەلوول
لەنێو توانەوەی مۆمی
نێو شەوەکانی لە دایکبوونی شەونم دا مانبگرن
نەبادا /
پەپوولەیەک نیگەرانیەکانی
شکۆفەی گوڵەباخێک
نەناسێتەوە
ڕێبوارێک بە تەنیشت بیستانێکی سەربڕاودا
ڕەت ببێ و

ئاوڕێک لە بە خۆڵەمێشبوونی
پەڕوباڵی کۆترەکانی زەمەن نەداتەوە
نەبادا /
شەپۆلە خەواڵووەکانی دەریا
چیتر گوێ لە ژانە تیشکە لەبارچووەکانی
هەتاو ڕانەگرن
نەبادا /
بوومەلەرزەی نێو دارمەیتی کیشوەرەکان
لەگەڵ زەرد هەڵگەڕانی گوڵەگەنمەکانی بەهار
سڵاوێک لە یەکتری نەکەن
من بە چاوەکانی ئاو دەڕوانم
ئەو دەمانەی کاسە و پیاڵەی
شەڕابی عەشق و خۆشەویستیمان
پڕ دەبێ لە حەسرەتە پەمەییەکانی
بنار مەمکۆڵە گەرمەکانی یار

مانگە شەوە سەرخۆشەکەی
سەرلێوە قورمزیەکەی ئاگر
شوێنی ماچەکانی
گوڵە هەناریەکانی هەور ، ناناسێتەوە
ئەو سەحەرانەی
بوخچەی غەریزە تەڕەکانی
بنار مەمکۆڵە گەرمەکانی یار
لەنێو زەردەپەڕی ئاوێنە ئیرۆسیەکان ، ناکرێنەوە
ئەو شەوانەی
ئایەتەکانی عەشق
لەنێو مەجلیسی ژێر ڕەشماڵی
بنار مەمکۆڵە گەرمەکانی یار ، ناخوێندرێنەوە
ئەو دوای نێوەڕۆیە فێنکانەی
کانیە بەهارییەکانی
بنار مەمکۆڵە گەرمەکانی یار

دەنگیان دەنوسێ و
گۆرانی بۆ پێدەشتە تێنووەکانی
جەستە شەقار شەقاربووەکەی
نێو ڕۆحی من ناڵێنەوە
من ئیتر بە چاوەکانی ئاو دەڕوانم
نەبادا /
شنەبایە شینەکانی عەشق
لەنێو بالکۆنی غوربەتدا لەبیرم بکەن
کۆڵارە کۆچەرییەکانی چارەنووسیش
لەسەرپشتی خۆیان هەڵم نەگرن
بەرەو خەمە سپیەکانی
بنار مەمکۆڵە گەرمەکانی نیشتیمانم
نەمبەنەوە ... !

**سەرەتای ئۆگستی ٢٠٠٨**

# لەسەر جەستەی ڕووتت لە خاچم دە

بە وێنەی هەتاو
پڕم لە نیگا سپیەکانی بەفر
بە وێنەی ئاگر
پڕم لە نیگا گەرمەکانی عەشق
نیگاکانم گوڵبژێرکە
لە چاوانت بمهێڵەوە
لە نێو دڵتا
ماڵی خۆرم پێنیشان دە
لە نێو وەرزی سەهۆڵبەندانی غوربەت
دەرم بێنە و

به نیگاکانت بم شێله
له نێو زەردەخەنەی ڕۆحت ، له خاچم ده
بەرسێبەری دارسنەوبەرەکانی عەشق
ماڵی هەتا هەتایەی منه
هەموو بەیانیانێک
ژیان دێت و بەبەردەمما تێدەپەڕێ
بەهار دێت و بەبەردەمما تێدەپەڕێ
مێژوو دێت و بەبەردەمما تێدەپەڕێ
تەنها
نیگا گەرمەکانی بەفر و
نیگا خۆڵەمێشییەکانی تەنیایی و
نیگا شەرمناوییەکانی تۆیه
له چاوانم دەمێننەوه
به پەیژه خەڵووزاوییەکەی نیگاکانت
هەڵدەگەڕێم

دەڕۆم کێڵگەکانی هەور
پڕدەکەم لە ڕەنگی جوانییەکانی تۆ
بە پەراسووی نیگاکانی بەفر
هەڵدەگەڕێم
دەڕۆم کێڵگەکانی خۆرەتاو
پڕدەکەم
لە نەسیمە گڕگرتووەکانی عەشقی تۆ
لەوێدا
سەمفۆنیای شەوەکانی مردن
پڕدەکەم
لە ڕووناکییە ئاگراوییەکانی جەستەی تۆ
درەختەکانی مانگ
پڕدەکەم
لە پرشنگە زێڕینییەکانی ڕۆحی تۆ
نیگاکانم گوڵبژێرکە

لە نێو ڕەشەبای نیگەرانی دەرمبێنە
وەک ملوانکە لەسەر سینگت هەڵمبگرە
لە نێو ڕووباری
فرمێسکەکانی سەرگۆنات / لە خاچم دە
بمبەخشە
ئەگەر لەگەڵ خۆر ئاوا ببم
بڕژێمە نێو هەناسەکانی مردن
ئەگەر سبەش کە خۆرهەڵهات
من و شیعر و نیگاکانم نەبینیەوە
بمبەخشە
ئەگەر لەگەڵ باران
بڕژێمە نێو
بەیانیە بریندارەکان و
شکۆفە کریستاڵیەکانی زەمەنێکی تر
ئەگەر دووسبەش کە خۆرهەڵهات

من و شیعر و نیگاکانم نە ناسیەوە
لە خاچم دە بەرلەوەی
لە نێو باخچەی یادەوەرییەکانت
ببم بە گوڵێکی سپی یاسەمینی
لە خاچم دە بەرلەوەی
ببم بە توحفەیەک لە تۆز و غوبار
ببم بە دوای نیوەڕۆیەکی
پڕ لە ئەفسانەکانی سێبەر
لە چاوەکانم بڕوانە و
نیگاکانم گوڵبژێرکە
لە بەردەرگای خەونەکانت / لە خاچم دە
لەسەر بەرماڵی نوێژەکانت / لە خاچم دە
لە نێو بوخچەی حەزەکانت / لە خاچم دە
نیگاکانم گوڵبژێرکە
لەسەر جەستەی خۆرئاوابوونی ئێوارانت / لە خاچم دە

لەسەر جەستەی زەردەپەڕی بەیانیانت / لە خاچم دە
لەسەر جەستەی برژانگەکانی تەنیاییت / لە خاچم دە
لەسەر جەستەی ڕووتی خودا / لە خاچم دە
لە ئامێزت هەڵمبگرە
لەسەر پەنجەی هەر گەڵایەکی هەڵوەریو / لە خاچم دە
لەسەر گۆنای هەر کڵۆبەفرێکی خۆرنەدیو / لە خاچم دە
لەسەر بەرگی کتێبە ئاسمانیەکانی عەشق / لە خاچم دە
لەسەر تابلۆ وەهمییەکانی دۆزەخ / لە خاچم دە
لەسەر لێوی گوڵە نێرگزێکی ئاوی / لە خاچم دە
لەنێو بازنەکانی بێدەنگیت بمهێڵەوە
بە بڵێسەی نیگاکانت بمسووتێنە و
لە بەهەشتی نێو مەمکەکانیشت ، جێمکەرەوە
لە خاچم دە
ئەو شەوانەی دێم و
لەسەر کانیەکەی کچێنیت

جگەرەیەکی بخووری و
مۆمێک بە پشکۆ سوورەکانی ڕامووسانی
دادەگیرسێنم
لە خاچم دە
ئەو وەرزانەی
لەنێو دوورگە سپیەکانی ئاسوودەگی
دوای موچرکە ئۆخژنئامێزەکانی توانەوە
ئەفسانەی حیکمەتەکانی
ماڵئاوایی و دابڕان دەنووسمەوە
لە خاچم دە بەرلەوەی
لەنێو یادەوەرییە ڕەشۆکییەکانی قەدەر
با : بە خۆڵەمێشی نیگاکانی بەفر
بمنووسێتەوە
بەرلەوەی
شەوگارە بێدارەکانی

نێو کتێبە ئەسمەرییەکانی ونبوون
بمنووسنەوە
تۆ لە هەیوانی
غەریزە هەنارییەکان و لەسەر جەستەی ڕووتت / لە خاچم دە
لەنێو ئاوێنە ئاوریشمیەکەی ڕۆحی خۆت
هەڵمبگرە و
لە نێو نیگا گەرمەکانیشت بمهێڵەوە

**کۆتایی ئۆگستی ٢٠٠٨**

# ئەفسانەی جوانیەکانی مێیینە

**تابلۆی یەکەم :**

**(مێیینەی خاک)**

بەفر
ملوانکەی مێیینەی خاکە
لەنێو مەمکۆڵەی شەوەکان دا
شیعریش
هەناسە سپیەکانی منە
لەنێو خەونەکانی غوربەتیم دا
لە نێوان

تەنیایی من و تەنیایی مێیینەی خاک
باخچەیەک هەیە
پڕ لە سێوی سپی سپی
زەمەنێک هەیە
پڕ لە کاتژمێری سپی سپی
قەسیدەیەک هەیە
پڕ لە هاواری سپی سپی
باخچەکان و زەمەنەکان و قەسیدەکانیش
لەنێو وەرزە سپیەکانی
نێو ڕۆمانەکانی عەشق
دەردەکەون

## تابلۆی دووەم

## (مێیینەی خۆرەتاو)

ئەستێرەکان
مەمکۆڵەکانی مێیینەی خۆرەتاون
بە جێماون لە جێژووانەکان دا
ئەو دەمانەی دەدرەوشێنەوە
شەوە تاریکەکانی
نێو تەنیاییەکانی من و
نێو جەستە ڕووتە شووشەییەکەی مانگ
ڕووناک دەکەنەوە

## تابلۆی سێیەم

## (مێیینەی ڕووبار)

مێیینەی ڕووبار
شەوێک دێتە نێو خەونەکانی من
شەوێک لە باوەشی عاشقە سەرمەستەکانی
کەنار دەریا دەمێنێتەوە
شەوێک گوێ لە سەمفۆنیا کلاسیکیەکانی
تاڤگەکان ڕادەگرێ
شەوێک لە نێو ،
شەقامە ڕووناکیەکانی با دەسووڕێتەوە
ئەو شەوانەی
مێیینەی ڕووبار

سەما لەگەڵ شیعرەکانم دەکات
هەرچی دەماری پیاوەتیم هەیە
لە جەستەی خۆی دەئاڵێنێ
هەرچی یادەوەری کوڕێنیم هەیە لەنێو ئەلبوومی
یادەوەریەکانی کچێنی خۆی دا
هەڵیان دەگرێ
شەوەکانم پڕ دەکات
لە خەیاڵە پارانۆیدەکانی تەنیایی
لە بالکۆنە غوربەتیەکانی مردن دا
بە تەنها دەمهێڵێتەوە
خۆیشی
هەر شەوێک لەسەر سینگی شەپۆلێک
ڕۆژ دەکاتەوە

**تابلۆی چوارەم**

**(مێیینەی باخچە)**

ئەو دەمانەی
گوڵە جوانەکانی عەشق بۆن دەکەم
یان سەیری ڕەنگە سیحراویەکانی پەلکەزێڕینەی
پاش بارانەکانی بەهار دەکەم
مێیینەی باخچە
دێت و تێکەڵ
بە ڕەنگە ئەستێرەییەکان و
گۆرانییە گەردەلوولییەکانی تەنیاییم دەبێ
دێت و

لەنێو چوارپایە نارنجییەکانی خەیاڵم
ڕادەکشێ
بەدەسماڵێکی ئاوریشمینی
تەنک تەنک
تەنک تەنک تەنک
تەنک تەنک تەنک
تەنک تەنک تەنک
خۆی دادەپۆشێ
نەرم نەرمیش
مەمکە خرپنە زایەندیەکانی
لە سینگی شیعرەکانم دەخشێنێ

## تابلۆی پێنجەم

### (مێیینەی سێو)

هەموو جارێک
کە دەچمە نێو باخی سێوان
لەنێو کاولۆکە تەنهاییەکانی مێیینەی سێو
بەرانە کێویلکەیەکی نێو شیعرەکانم
بەجێدێڵم
شەوانانیش
میلۆدی نالّە ناڵ و ئاهە ئاهی
جووتبوونیان دەنووسمەوە

## تابلۆی شەشەم

## (مێیینەی ڕەنگی سپی)

من لەنێو خەونەکانی
مێیینەی ڕەنگی سپی
لەبیرمایە
یەکەم وردیلە شیعری خۆمم نووسی
وشەکانی سادە بوون
وەک ژیانە سادەکەی
عاشقانی لێو بەخەمی نێو جێژووانەکانی لای خۆمان
خەیاڵەکانی سپی بوون
وەک مردنی نیشتیمانە سپیەکەی
نێو کیشوەری خەونەکانمان

## تابلۆی حەوتەم

### (مێیینەی لم)

سەردەمانێک
لەنێو دەفتەرە شەستپەڕیەکانی منی شاعیر
تەنها دیوە جوانەکانی
مێیینەی لمم دەنووسییەوە
بەڵام لەو ڕۆژهوەی
مێیینەی لم
بوون و دەنگ و هاوار و ئایندەمی
لەنێو ناوەوەی خۆیدا خنکاندووە
ئیدی منیش
لەم ڕۆژهوە بڕیارمدا

تەنها دیوە ناشیرنەکانی بنووسمەوە
پەرتبوون و ئاوێزانبوونەکانیش
لەنێو کەژاوەی یادەوەریەکانم
بسڕمەوە

## تابلۆی هەشتەم

## (مێیینەی خەون)

لە شەوێکی بێداری باراناوی
لەنێو مێیینەی خەونێکی تەڕ
بە ( خودا و خەون و خولیا ) کانی خۆم
ئاشنا بووم
لەو شەوەڕا من شێتانە

هەناسە تەڕەکانی خەونەکانم دەنووسمەوە
من شێتانە
بۆ جوانییەکانی جنسی مێ دەچەمێمەوە

## تابلۆی نۆیەم

### (مێیینەی بەفر)

هەموو ساڵێک
لەگەڵ یەکەمین یەکشەممەی مانگی بەفرانباردا
من / ئەفسانەی ئاوێتەبوونەکانی عەشق و
عەشق و ئاوێتەبوونە ئیرۆسییەکان / دەنووسمەوە
هەموو ساڵێک لەگەڵ زەنگی
یەکەمین کاتژمێرەکانی ئەم مانگەدا
مێیینەی بەفر
دێتە نێو شەوەکانم سڵاوێک لە غەریبیم دەکات و

لەنێو بێدەنگی ژوورەکەمدا
بە ڕووتی ڕادەکشێتەوە
ژوورێکی /
پڕاوپڕ لە کتێب و لە زەردەخەنە و لە مۆم و
لە گوڵ و لە میوەجاتەکانی بەهەشت
ژوورێک پڕاوپڕ لە سەمفۆنیای خۆشەویستی .

## تابلۆی دەیەم

## (مێیینەی خۆڵەمێش)

من مێیینەی خۆڵەمێشم
ڕەگەکانم لەنێو ڕۆحی ئاگر دایە
چاوەکانم لە نێو ئاو و
پەنجەکانم لە نێو خۆرەتاوی تۆفان دایە
مەمکەکانم لە نێو هەورە سپیەکانی

بروسکە و
فرمێسکەکانم لە نێو
شەونم و شەپۆلە شینەکانی شیعر دایە
من خۆڵەمێشی جوانیم
تریفەی جوانییەکانم
لەنێو ئەفسانەی
شەوە ڕۆمانسییەکانی عەشق و
لەنێو هاوارە گەرمەکانی ژیان دایە !

ئۆکتۆبەری ٢٠٠٨

# برینەکانم

هەموو شەوێ
مردنم لەنێو تەنیاییم
دەردەکەوێ
بەر لەخەوتن زەردەخەنەیەکم بۆ دەکات و
بێدەنگ بێدەنگ
گۆنای خەونەکانم ماچ دەکات
تەنیاییم لەنێو مردنم دا
هەموو شەوێ
بە مۆسیقای وردیلە شیعرێک
نەرم نەرم
بە سەمام دەهێنێ

ونبوونم
هەموو بەیانیانێک
لەسەر گەڵا شەونماوییەکانی ئومێدەکانم
بێدەنگ بێدەنگ
لاوکەکانی گەڕانەوەم بۆ دەڵێ
ئاخ /
چ ئاستەمە
هەموو چرکەساتێک
بە ئەسپایی
ڕەنگەکانی
مردن و تەنیایی و ونبوون
لە تابلۆی برینەکانم دەچۆڕێن ... !

**کۆتایی نۆڤەمبەری ٢٠٠٨**

# گەمەیەک لەنێو بازنەکانی غوربەت

نم نم بارانی ئەشک لە چاوانم ئەتکێ
کە بیر لە شەوە تاریکەکانی
غوربەتم دەکەمەوە

نم نم ئەشکە باران ئەتکێ لەچاوانم
کە بیر لە شەوە
غوربەتییە تاریکەکانم دەکەمەوە

نم نم بارانی ئەشک ئەتکێ لە چاوانم
کەبیر لە تاریکە شەوەکانی
غوربەتم دەکەمەوە

نم نم لە چاوانم ئەتکێ ئەشکە باران
کە بیر لە تاریکە غوربەتییەکانی
شەوەکانم دەکەمەوە

نم نم لە چاوانم ئەتکێ بارانی ئەشک
کە بیر لە غوربەتی
شەوە تاریکەکانم دەکەمەوە

نم نم لە چاوانم بارانی ئەشک ئەتکێ
کە بیر لە غوربەتە تاریکەکانی
شەوەکانم دەکەمەوە

نم نم ئەتکێ بارانی ئەشک لە چاوانم
کە بیر دەکەمەوە
لە شەوە تاریکە غوربەتییەکانم

نم نم ئەتکێ ئەشکە باران لە چاوانم
کە بیر دەکەمەوە
لە شەوە غوربەتییە تاریکەکانم

نم نم ئەتکێ لە چاوانم بارانی ئەشک
کە بیردەکەمەوە
لە تاریکە شەوە غوربەتییەکانم

نم نم ئەتکێ لە چاوانم ئەشکە باران
کە بیردەکەمەوە
لە تاریکە غوربەتییەکانی شەوەکانم

بارانی ئەشک ئەتکێ نم نم لە چاوانم
کە بیردەکەمەوە
لە غوربەتی شەوە تاریکەکانم

بارانی ئەشک نم نم لە چاوانم ئەتکێ
کە بیردەکەمەوە
لە غوربەتی تاریکە شەوەکانم

بارانی ئەشک لە چاوانم نم نم ئەتکێ
کە لە شەوە تاریکەکان
بیر لە غوربەتم دەکەمەوە

ئەشکەباران نم نم لە چاوانم ئەتکێ
کە لە شەوە تاریکەکانی
غوربەتم بیردەکەمەوە

ئەشکەباران نم نم ئەتکێ لە چاوانم
کە لە شەوە
غوربەتییە تاریکەکانم بیردەکەمەوە

ئەشکە باران ئەتکێ نم نم لە چاوانم
کە لە شەوە غوربەتییەکان
بیر لە تاریکی دەکەمەوە

ئەشکە باران لە چاوانم نم نم ئەتکێ
کە لە تاریکی شەوە غوربەتییەکانم
بیر دەکەمەوە

لە چاوانم نم نم بارانی ئەشک ئەتکێ
کە لە تاریکە شەوەکان
بیر لە غوربەتم دەکەمەوە

لە چاوانم نم نم ئەشکە باران ئەتکێ
کە لە تاریکی
بیر لە غوربەتی شەوەکانم دەکەمەوە

لە چاوانم نم نم ئەتکێ ئەشکەباران
کە لە تاریکەغوربەتیەکانی شەوەکانم
بیر دەکەمەوە

لە چاوانم بارانی ئەشک نم نم ئەتکێ
کە لە تاریکە غوربەتییەکان
بیر لە شەوەکانم دەکەمەوە

لە چاوانم ئەشکە باران نم نم ئەتکێ
کە لە تاریکی
بیر لە شەوە غوربەتییەکانم دەکەمەوە

لە چاوانم ئەتکێ نم نم بارانی ئەشک
کە لە غوربەتی
شەوە تاریکەکانم بیر دەکەمەوە

ئەتکێ نم نم لە چاوانم بارانی ئەشک
کە لە غوربەتی شەوەکانم
بیر لە تاریکی دەکەمەوە

ئەتکێ نم نم لە چاوانم ئەشکە باران
کە لە غوربەتی
بیر لە تاریکە شەوەکانم دەکەمەوە

ئەتکێ بارانی ئەشک نم نم لە چاوانم
کە لە غوربەتە تاریکەکانی شەوەکانم
بیر دەکەمەوە

ئەتکێ ئەشکە باران نم نم لە چاوانم
کە لە غوربەتە تاریکەکان
بیر لە شەوەکانم دەکەمەوە

ئەتکێ لە چاوانم نم نم بارانی ئەشک
کە لە غوربەتی
بیر دەکەمەوە لە شەوە تاریکەکانم

ئەتکێ لە چاوانم نم نم ئەشکە باران
کە لە غوربەتی
بیر لە شەوە تاریکەکانم دەکەمەوە

**نۆڤەمبەری ٢٠٠٨**

# ژیان و قەدەر

**پەردەی کوڕێنی :**

ئەو سەردەمەی
لەنێو منداڵدانی دایکم بووم
بە پەردەیەکی تەنکی مەیلە و پەمەیی
دەورە درابووم
وابزانم خودا بوو ،
لەسەر پەردە تەنکەکە بۆی نووسیبووم
( ئەوە پەردەی کوڕێنیتە
سبەی
هێز و قەڵەم و ڕووناکی و
دووسبەش
سەروەری و نەمریت پێدەبەخشێت ! )

**ڕۆحی ڕووتی شیعر :**

ئەو شەوەی
ڕۆحی شیعرم بە ڕووتی بینی
ئەو شەوە بوو
کە بڕیارمدا
بەدوای
حەقیقەتی جوانییەکانی
شیعر و عەشق و
حەقیقەتی جوانییەکانی
گوڵ و ئاوێنەدا بگەڕێم
لە نێو قەدەری خاک و
لەنێو نیگەرانیەکانی باخچەش
بهێنمەوە ...

هەر ئەو شەوە
لەنێو خەیاڵە ئیرۆسییەکان و
لەنێو جووتبوونە ڕۆمانسییەکانمدا
بۆ کەمجارم بوو
ڕۆحی شیعر بە ڕووتی ببینم و
شەرمیش
لە جوانییەکانی عەشق و
لە جوانییەکانی گوڵ و
لە خەمە خەملیوەکانی خاک و
لە نیگەرانییە نەرمەکانی باخچەدا بکەم

## ژیان

ژیان کورتە
بەشی هەموو
ئومێدە ئاوییەکانم
ناکات
شەوەکانم
بەرگەی هەموو
خەونەکانم ناگرن
خەیاڵە ئیرۆسییەکانم
هێشتا
بە نێو هەموو
ڕووبەرە نادیارەکانی شیعردا
ڕەت نەبوون

قەڵەمەکەم هێشتا
نەیتوانیوە
فڕینەکان و زەردەخەنەکان و
مردنەکانی مناڵیم بنووسێتەوە
من دەبێ
یان تا ئەبەد بژیم
یان جارێکی تر
لە نێو ماڵە ئیرۆسییەکەی شیعر
بژییێمەوە !

##ماڵەکانم

من ئەویندارێکی ئیرۆسیم
تەنها یەک ماڵ
جێگەی ئارەزووە چەپێندراوەکانی دوێنێ و
خەونە ،
لێوتەڕە خونچەییەکانی ئێستام
نابێتەوە
من دەخوازم
ماڵێکم هەبێت بۆ عەشق
ماڵێک بۆ سەما
ماڵێک بۆ جووتبوون
ماڵێک بۆ خەون

ماڵێک بۆ شیعر
ماڵێک بۆ مردن و
ماڵێکیش بۆ ژیان ... !

**قەدەر**

من لە فڕین بێزار نەبووم
بەڵام ،
ئەستێرە سوورە کۆچەرییەکان
وەکو جاران
نامگرنە باوەش
من لە پیاسە بێزار نەبووم
بەڵام ،
گەڵاکان وەکو جاران
سڵاو لە تەنیاییم ناکەن

من لە عەشق بێزار نەبووم
بەڵام ،
ژنەکانی ئاو
وەکو جاران
شەوانان تەڕم ناکەن ... !

**سەرەتای دیسەمبەری ٢٠٠٨**

# هاودژەکان

**(نزیکی دوور)**

ئەی ئەو کەسەی
لە ڕۆحم نزیکی و لە جەستەم دوور
ئەی ئەو کەسەی
لە ڕۆحم دووری و لە جەستەم نزیک

ئەی ئەو کەسەی
لە ڕۆحم نزیکی / نزیک نزیک نزیک
لە جەستەم دووری / دوور دوور دوور

ئەی ئەو کەسەی
لە ڕۆحم دووری / دوور دوور دوور
لە جەستەم نزیکی / نزیک نزیک نزیک

ئەی ئەو کەسەی
لە جەستە و ڕۆحم
نزیکیەکی دووری و دووریەکی نزیکی
تەنها
ئیمەیلێک و
زەردەخەنەیەک و هیجی تر ... !

## (ساردی گەرم)

ئەی ئەو کەسەی
لە یەکەمین ژووان
ماچەکانت گەرم و
خوداحافیزییەکەت سارد سارد بوو
ئەی ئەو کەسەی
لە دوواهەمین ژووان
ماچەکانت سارد و
خوداحافیزییەکەت گەرم گەرم بوو

ئەی ئەو کەسەی
لە یەکەمین ژووان
ماچەکانت سارد بوون / سارد سارد سارد
خوداحافیزییەکەت گەرم بوو / گەرم گەرم گەرم
ئەی ئەو کەسەی
لە دوواهەمین ژووان
ماچەکانت گەرم بوون / گەرم گەرم گەرم
خوداحافیزییەکەت سارد بوو / سارد سارد سارد

ئەی ئەو کەسەی
لەیەکەمین ژووان و لە دوواهەمین ژووان
ماچەکان و خوداحافیزییەکەت
گەرمیەکی سارد و ساردیەکی گەرم بوون
تکا دەکەم
بگەڕێوە نێو ژیانم و هیچی تر ... !

## (زیندووی مردوو)

من وا هەست دەکەم
له نێو نیشتیمانی غوربەت
زیندوویەکی مردووم
له نێو نیشتیمانی دایک
مردوویەکی زیندووم
له نێو نیشتیمانی خەون
زیندوویەکی مردووم
له نێو نیشتیمانی عەشقیش
مردوویەکی زیندووم
بەڵام / له نێو نیشتیمانی شیعر
من هەمیشە زیندووم ... !

**(هەورازی نشێو)**

لە نێو شەوەکانی غوربەتم
ئەودەمانەی بە بنار هەورازەکانی
رووناکی هەڵدەگەڕێم
لە سەر ترۆپکی هەورازاکاندا
خۆم لە نشێوی
بنار ڕەنگەکانی ئارەزووەکانم دەبینم
لەوێدا ،
لەسەر ترۆپکیترین هەورازەکانی غوربەتم
خۆم لە نشێوترین
رووبەرەکانی وجودم دەبینم
چونکە من هەمیشە

لە نێو هاوارەکانی غوربەتم
بەسەر هەورازە نشێوەکان دا
سەردەکەوم
یان بەنێو
نشێوە هەورازەکان دا .. تێدەپەڕم !

**(ڕەشی سپی)**

من لە نێو باخچەی
خەم و نیگەرانیەکانم
ئایندەی خۆم
ڕەش دەبینم
ڕەشێکی سپی سپی
سێبەری شیعرەکانم
لە شەوە قەترانییە خەڵووزاویەکان دا

سپی دەبینم
سپیەکی ڕەش ڕەش
من ،
هەموو ڕەنگەکانی عومرم
هەموو عومری ڕەنگەکانم
هەموو ڕەنگی غەریزەکانم
هەموو غەریزەی ڕەنگەکانم
ڕەشێکی سپین / سپی سپی سپی
هەندێجاریش ،
سپییەکی ڕەش / ڕەش ڕەش ڕەش ... !

## (دیاری بزر)

ئیتر تەواو
نە لەنێو گەڕەکەکانی ئاو
نە لەنێو کۆڵانەکانی خۆرەتاو

نە لەنێو شەقامەکانی هەور
نە لەنێو میترۆکانی غوربەت
نە لەنێو کێڵگە زەردەکانی پاییز
لەنێو هیچکام
لە ڕووبەرەکانی ئەم وجودە
جارێکی تر نامبینیەوە !
ئیتر تەواو
لە نێو کام گەڕەکی ئاو لەدایک بووی
بگەڕێوە بۆ هەمان شوێن
لەنێو کام کۆڵانی خۆرەتاو
بۆ یەکەمینجار
چاوت بە ڕووناکی کەوت
بگەڕێوە بۆ هەمان شوێن

لە نێو کام شەقامی هەور
بۆ یەکەمینجار
مەمکۆڵە و جەستە زایەندییەکەت
بە نیگاکانی من گەرم داهاتن
بگەڕێوە بۆ هەمان شوێن
لە نێو کام میترۆی پڕ لە ئاهەکانی غوربەت
بۆ یەکەمینجار
بە ئەسپایی منت ماچ کرد
بگەڕێوە بۆ هەمان شوێن
لە نێو کام کێڵگە زەردەکانی پایز
بۆ دواجار
ماڵئاواییت لە من کرد
بگەڕێوە بۆ هەمان.شوێن
ئیتر تەواو

لەکام ڕێگاوە هاتووی
بە هەمان ڕێگای خۆت دا بگەڕێوە
بگەڕێوە و
جارێکی تر
لە نێو ڕووبەرەکانی ئەم وجودە
نامبینیەوە
بەڵام گوڵم تکا دەکەم
لەگەڵ هەموو
نیگەرانی و هەناسە ساردی و بێئومێدیەکانت
چاوێکێش بە لیستی
عاشقە یاخیبووە سەرکاشەکان دا
بگێڕە
ئەو عاشقانەی
لەنێو ئەشکەوتەکانی بۆشایی
لە نێو ماڵە ئەبەدییەکانی عەشق

بەدیار ئاگردانەکانی خەون
ئایەتەکانی یاخیبوون دەنووسنەوە و
وەرزەکانی تەنیایی و باخچەکانی عەشق
ڕەسم دەکەن
ئەو پەیامبەرە ڕەبەنانەی
لە نێو ڕووبەرەکانی وجود
دیارییەکی بزر و
لە نێو ڕووبەرەکانی خەیاڵیش
بزرێکی دیارن
ڕەنگە لەوێدا بمدۆزیتەوە ... !

**سەرەتای دیسەمبەری ۲۰۰۸**

# تەنها شەوێک لە نێو مندا بمێنەوە

تەنها شەوێک
با بە زمانی ئاو قسە بکەین
یان بە زمانی ڕووناکی
یان خۆمان لە گەردەلوولەکانی گوڵ وەربدەین
یان لەژێر تاڤگە ئیرۆسییەکانی ئەوین
خۆمان بشۆین
یان بەیەکەوە لە پەنجەرە کراوەکانەوە
لە ئەستیرەکانی موحیبەت بڕوانین

تەنها شەوێک
لەنێو وەرزە جۆزەردانیەکانی تەمەن
لە نێو غروربوونی پیاوەتی من بمێنەوە و
منیش دێمە نێو / دڵشکانەکان و
لەنێو ناسکی مێیینەی تۆ دەمێنمەوە
لەوێدا هاوکێشەیەک
بۆ ئایندەی ئەو عەشقەمان بنووسینەوە

تەنها شەوێک
دوای خوێندنەوەی شیعرێکی من
دیوانەکەم لە تەک خۆتدا بخەوێنە
یان وێنەیەکی بچکۆڵانەی من
بخەرە نێو قافقورئانەکەی سەر سینگت
یان وشە شەرمنۆکاوییەکانی نێو نامەیەکم

لەنێو ستیانەکەت بهێڵەوە
لێیانگەڕێ
بە ئەسپایی خۆیان بخزێننە نێو دوورگەکانی خەیاڵت
ئەگەر بکرێ هەرلەوێدا بمێننەوە

تەنها شەوێک
بەخەتخەتۆکە ڕەنگ پاستیلیەکانی عەشق
نیگارێک یان کۆدەکانی تەنیاییم
یان پەیکەرێکی مردنم بکێشە
هەر ئەوشەوە
ڕێگەم بدە لە دەرگای چاوەڕوانیت بێمە ژوورەوە
لەوێوەش بۆ نێو خەونەکانت شۆڕببمەوە

تەنها شەوێک
بەسەر بێدەنگیم دا بقیژێنە و پێمبڵێ
( من لەنێو مردنەوە نەهاتووم - تا بگەڕێمەوە نێو مردن )
یان لەجیاتی جەستەی خۆت
ئاگر لە پەراسووەکان و
لە ماسولکەکانی تووڕەیی من بەربدە

تەنها شەوێک
ڕێگەم بدە
پیاوەتی خۆمت بۆ بکەم بە فەرشێک
تۆش بەسەریدا بڕۆ
خەونەکانی خۆمت بۆ بکەم بە باخچەیەک
تۆش لەناویدا بمێنەوە

هەر ئەو شەوە
مۆمێک لە مۆمەکانی نێو چاوەکانی خۆت
لەنێو ژوورێک لە ژوورە تاریکەکانی دڵم / دابگیرسێنە
بە سۆزێکی ژنانەوە گۆرانیم بۆ بڵێ و
پرمکە لە شەوغە شەرمناوییەکانی مێینەی خۆت
لەنێو فیردەوسەکانی توانەوەش بەسەمام بهێنە

تەنها شەوێک
لەنێو بەرائەتی زەردەخەنەی سەر ڕوخسارت
دوور لە من و
دوور لە جەستە و لە ئارەزووەکان و لە شیعرەکانی من
لەگەڵ خۆتدا
لەگەڵ بخووری حەزەکانت
لەنێو سێبەری جوانیەکانی خۆت

بەتاقی تەنێ رۆژ بکەرەوە
تەنها ئەوشەوە
من لەکوێ بم مەیێ بۆ ئەوێ
مردنم لەنێو خۆتدا مەلاوێنەوە
لێوە زایەندییەکانی خۆت
بە خۆڵەمێشی خەمەکانی من مەشێوێنە

تەنها شەوێک
وەک چۆن منداڵ لەنێو بێشکە دەپێچنەوە
لەنێو خۆتدا زیندانیم کە و بمپێچەوە
بە دەست و قاچەکانی بەستراومەوە
ئەگەر گریام
تەنها گۆی مەمکێکت بخەرە نێو دەمم
ژیر دەبمەوە

تەنها شەوێک
ئەوشەوەی / تۆش ئارەزووی گریانت هەیە
لەنێو مندا
تا ئەوپەڕی رووبەرەکانی ئازادی / ئازاد بە
هەرچییەک لە مندا بۆ ژیربوونەوەی خۆت
هی تۆیە و بملێسەوە

تەنها شەوێک
لەنێو هەستە نەستیەکانم
( فرۆید ) یانە
پارچە پارچە بمخوێنەوە
دەمار دەمار شیمکەرەوە
گۆشە گۆشە بمنووسەوە
ژوور بە ژوور ... بەس
شەوێک لە نێو مندا بمێنەوە

تەنها شەوێک
وەرە نێو یادەوەریەکانم
لایلایە بۆ منداڵیم بکە
تۆش /
دەتوانی بمگەڕێنیتەوە نێو ڕۆژهەکانی دوێنێی خۆت
پڕمکەیت لە بۆنی نەمامە نێرگزییەکانی کچێنیت
یان ئەلبوومی تەمەنم لەسەر کۆشی خۆت دابنێ
پەڕ پەڕ هەڵمدەوە
وێنە وێنە لە قووڵایی چاوەکانم بڕوانە
سەیرم بکە گوڵەگیان
تێر تێر سەیرمبکە و هیچی تر

تەنها شەوێک
بەنێو بەهەشتی مێیینەت دا
بمگێڕە و
سەبەتەکانی ئومێدم
پڕکە لە سێوە مزرەکانی موراد
نەرم نەرمیش هەموو شەوێک
چیرۆکی پیاوێکی تەنیا
لەنێو دەفتەری یادەوەریەکانت بنووسەوە

تەنها شەوێک
وەکو من لە نێو شەونامەی غەریبی خۆتدا
لەگەڵ مەرگی پرسیارەکان ڕابکشێ
یان لەنێو ئاوێنەی مەرگێکی شێنەیی
دەسماڵی ڕازەکانت ڕاوەشێنە

نیگاری مەراقەکانیشت
بە ڕەنگە تۆخە نیگەرانیەکان ڕەنگ بکە

تەنها شەوێک
وەرە نێو شەوە بێ ئەستێرەییەکانی ڕۆحم
قووڵ قووڵ / دوور دوور بڕۆ
بۆ ئەوپەڕی ڕێگەکانی تاریکی
لەوێدا بوخچە چەپێندراوەکانی
نێوناخ و شیعرەکانم بکەرەوە
کتێبە تۆز لەسەرنیشتووە نەرجسییەکانم بسووتێنە
ڕووناکمکەرەوە
وەکو شەقامە ڕووناکەکانی نێو چاوەکانی خۆت
پاکمکەرەوە
وەکو تیشکە پاکیزەییەکانی خۆرەتاوی مێینەی خۆت

تەنها شەوێک
ممبە لەگەڵ خۆتدا
بۆ هەرکوێیەک دەڕۆیت
بۆ نێو هەر توونێل و میترۆیەک
بۆ هەر مەیخانەیەک و تیاترۆخانەیەک
یان هەر یانەیەکی شەوانەی سەما
بۆ هەر
کەنیسەیەک ، مزگەوتێک
ماڵێک لە ماڵەکانی خودا
بۆ هەر کەنار دەریایەکی ونبوون
بۆ هەر کیشوەرێکی مردن
بۆ هەر سێگۆشەیەکی خۆکوشتن
بۆ نێو هەر دەریاچەیەک و ئاسمانێک
بۆ سەر هەر ئەستێرەیەک / گوڵەگیان
بەس ممبە لەگەڵ خۆتدا

تەنها شەوێک
نامەیەک ، ئایەتێک
یان ئیمەیلێکم بۆ بنێرە
گوڵێک لە گوڵدانەکانی هەناسەت
گەڵایەکی نێو کتێبە کۆنەکانی زەردەخەنەت
تاڵە قژێکی پرچە خەنەییە بۆندارەکەت
گوڵەگیان بەس شتێکم بۆ بنێرە

تەنها شەوێک
لە چاوەڕوانیم بە
لە فرۆکەخانەکەی ( هەولێر )
یان لە کۆڵانی گەڕەکێک لە گەڕەکە میللییەکان
یان لەنێو هەر ڕەز و باخچە و بنار قەدپاڵی شاخێکی سەرسنوور
یان لەژێر ڕەشماڵی هەر ئاوارەبوونێک
یان لە هەریەکێک لەو شەقامانەی

بەدەوری شار و ئاسمان و دەریاکان دەسووڕێنەوە
لەهەر جێگایەکی ئەم نیشتیمانە سپیەم بیت
گوڵەگیان / بەس لە چاوەڕوانیم بە
من دێم بۆ ئەوێ

تەنها شەوێک
با هەموو شەوەکە
هەموو کاتژمێرەکان و خولەکەکان و چرکەکانی ، بەیەکەوە بین
یان بەیەکەوە
لەنێو مردنەوە بگەڕێینەوە بۆ نێو ژیان
لەنێو کیشوەرە شێدارەکانی غوربەت بگەڕێینەوە بۆ نیشتیمان
لەوێوەش
بۆ نێو مانگەشەوە خامۆشە سەرمەدییەکان
گوڵی من با هەموو شەوەکە
بەس بەیەکەوە بین و هیچی تر

تەنها شەوێک
گەر تۆ چەند وشەیەکم بۆ بنووسیت
من دیوانە شیعرێک
گەر تۆ هێندەیٚ پشیەخەوێکت
کاتی خۆتم پێ ببەخشیت
من هەموو سەدەکان و وەرزەکان و شەوەکانی تەمەنی خۆم
گەر تۆ تەنها مەمکەکانی خۆتم پێ ببەخشیت
من ڕۆحی خۆم و
هەموو جەستەی خۆمت پێ دەبەخشم
ئەی گوڵە جوانەکەی
نێو مەرکانەکانی خەیاڵ و
نێو باڵکۆنەکانی مەراق و
نێو باخچەکانی ئەندێشە و
نێو پێدەشتەکانی تارمایی و

نێو مەشتەلەکانی سێبەر و
نێو پارکەکانی نیاز و
نێو گلێنەی چاوەکان و
نێو هەناسەی غەریزەکان و
نێو دێربەدێری شیعرەکانم
بەس تەنها شەوێک
لەنێو مندا بمێنەوەو هیچی تر !

**سەرەتای بەفرانباری ٢٠٠٩**

# خۆکوشتن

کە تۆ هاتیە نێو پارکەکەوە
من لەدەو ئاوەکە چاوەڕێــم دەکردی
چۆن منت نەدەبینی ؟!
من لەدەو ئاوەکە چاوەڕێم دەکردی
کە تۆ هاتیە نێو پارکەکەوە
ئاخر چۆن منت نەدەبینی ؟!!

ئاگام لێبوو
لەودەمەدا چاوت لەمن دەگێڕا
کە منت نەدۆزییەوە
قۆڵت خستە نێو قۆڵی کەسێکی ترەوە
لەودەمەدا چاوت لەمن دەگێڕا

کە منت نەدۆزیەوە
ئاخر ئاگام لێبوو
قۆڵت خستە نێو قۆڵی کەسێکی ترەوە !!
منیش بەر چاوەکانم
تاریک داهاتن
تاریک تاریک تاریک
بەمەبەستی خۆکوشتن
خۆم خستە نێو قووڵایی ئاوەکەوە !

# چاوەکانت

چاوەکانت
کتێبێکی تۆتومانی عەشقی منە
لە دەلاقەکانی پەرستگەی دڵم
دەدرەوشێنەوە
هەموو ڕۆژێک
لە نێو گۆڕستانەکانی تەنیاییم
دەیخوێنمەوە
ئەو شەوانەش
کە بێ مانگ و بێ ئەستێرە و
بێ مۆم و ئەنگوستەچاون
ژوورەکانی دڵ و
ماڵەکەمی پێ ڕووناک دەکەمەوە !

# لەنێو دیوانە شیعرێکم بمنووسەوە

لەنێو خەونێکی بەهاریت
خەونێکی پڕ لە بارانی تەڕ
بە پێنووسە ماسۆشییەکانی ڕۆحی خۆت
وێنەیەکم بکێشە و
لەژێر ڕێژنەبارانی دوای نیوەڕۆیەک
جێم بهێڵە
یان / لەنێو دڵۆپە فرمێسکەکانی
سەر ڕوخساری پایزێک و
لەنێو نیگەرانییە هەنارییەکەی
نێو چاوەکانی خۆرئاوابوونێک

جێم بهێڵە
یان / بەڕێنووسە ئیرۆسییەکانی خەیاڵ
بم نووسەوە و
لە گۆشەیەکی تاریکی مەیخانەیەک
لە تەنیشت مەرگی کێڵگەیەکی گوڵەگەنم
لەبن دیواری پەرستگەیەک
جێم بهێڵە
بم نووسەوە و
بمدەرە دەم ڕەشەبایەک
کە پڕاوپڕە لە مەرگی خاک
بمدەرە دەم دەریاچەیەک
کە پڕاوپڕە لە مەرگی زەمەن
بمدەرە دەم بورکانێک
کە پڕاوپڕە لە مەرگی هەتاو

کە بەیانیش لە خەو هەڵسای
لە ڕێژنە بارانەکانی
نێو خەونە بەهارییەکەت بڕوانە
لە دڵۆپە فرمێسکەکانی
سەر ڕوخساری پایز و
لە نیگەرانییە هەنارییەکەی
نێو چاوەکانی خۆرئاوابوونت بڕوانە
لە گۆشە تاریکەکەی مەیخانە و
لە مەرگی کێڵگەکانی گوڵەگەنم و
لە بندیواری پەرستگەکانت بڕوانە
دوور دوور بڕوانە
لەو ڕەشەبایەی
کە پڕاوپڕ بوو لە مەرگی خاک

لەو دەریاچەیەی
کە پڕاوپڕ بوو لە مەرگی زەمەن
لەو بورکانەی
کە پڕاوپڕ بوو لە مەرگی هەتاو
دوور دوور بڕوانە
هەر هەمووشیان پڕاوپڕن
لە خەونە تەڕەکانی تۆ
لە خەمە ماسۆشیەکانی عەشقی تۆ
لە کۆچ و هاوار و شەپۆل و
گۆرانییە کۆچەرییە ڕەشماڵییەکانی تۆ
یان بۆ شەوی دواتر
لەنێو دیوانە شیعرێکم
بمێنەوە و لەوێدا
لەنێو یادەوەریەکانی منیش
وێنەکانی خۆت و

ڕووتبوونەوەکانی خۆت و
نامەکانی خۆت بخوێنەوە
ئەو شیعرەیشم بخوێنەوە
کە ئاسمان
لە بازنەی سووڕانەوەکانی
مانگ و خۆر و ئەستێرەکان
بێزار دەبێ و
لە حەژمەت دڵتەنگییەکانی خۆی
ڕادەکات و دێت
لەنێو چاوەکانی من دەمێنێتەوە
یان ئەو شیعرەم
کە گەردەلوول
لە حەژمەت مەراقەکانی خۆکوشتن
بیابان و پێدەشتەکان جێ دەهێڵێ

دێت و لە نێو سییەکانی من / دەمێنێتەوە
یان ئەو شیعرەی
باسی کچۆڵە عاشقەکان دەکات
ئەوانەی لە ترسی مەرگ
ڕایان کردووە و هاتوون
لە نێو ژوورەکانی دڵی من
خۆیان شاردۆتەوە و
لەوێدا
چیرۆکی ژووانەکان و
یەکەمین ماچ و
یەکەمین ئاوێزانبوونە فەریکەییەکان و
چرکەساتەکانی یەکەمین
توانەوەیان دەنووسنەوە
بەنێو قووڵایی ناخ و دەروونم دا بڕۆ

گوڵەگیان
دوور دوور بڕۆ
دەمار بە دەماری عاتیفەم
هەموو غەریزە و مەراق و نهێنیەکانم
بخوێنەوە
هەموو وێنەکانی تەمەنم تەماشاکە
شەوە پڕ شەهوەتییەکان و
ترس و فۆبیا و نیگەرانییەکانم ببینە
یان ئەو وێنەیەی
لەدوا بەرگی دیوانەکەم داماوە
چەند خەمناکانە دەڕوانم
بیرم نایە لەوکاتەدا
لەژێر کەپری کام یەکێک
لە بێستانەکانی خەیاڵ بووم
بڕوانە گوڵم دوور دوور بڕوانە

لەنێو شەقامە هێمنەکانی نێو نیگام
لەنێو ڕامانە ئەندێشەییەکانی خۆت
مەرگی باخچە و
مەرگی خۆرەتاو و
مەرگی وەرزەکان
ببینە ..
کە چۆن بەیەکەوە پیاسە دەکەن
ڕامەچڵەکێ
تەنها سڵاوێکیان لێ بکە و
هیچی تر !
لە کۆتاییش
لەنێو یادەوەریەکانی ئەو شەوەت
لەنێو دیوانە شیعریەکەم
بە ڕێنووسەکانی زەردەخەنەت

بم نووسەوە   وەکو خۆم
وەک هەمیشە
خۆشتبوێم   وەکو خۆم
هەر لەنێو دیوانە شیعریەکەمدا
وەکو جاران
بە دزییەوە ماچم بکە و
لە نێو سێبەری باڵای خۆت بم شارەوە
بەو قەڵەمەش
کە لێوەکانتی پێ سوور دەکەی
وێنەیەکم بکێشە
بەڕەنگە خۆڵەمێشییەکانی شیعریش
ڕەنگم بکە
خۆم و وێنەکانی نێو دیوانە شیعرییەکەم
لە نێو ئەلبوومی ئارەزووەکانت
یان لەنێو دەلاقەیەکی تەمەنی خۆت

هەڵمان بگرە و
خۆت و یادەوەریەکانی ئەو شەوەشت
لەنێو دیوانە شیعرییەکەم و
لەنێو ژیاننامەی عەشقی من دا
وەک تۆتەمێکی خودایی
بۆ هەتاهەتایە بهێننەوە !

**فێبریوەری ٢٠٠٩**

# ئاگر و یادەوەری و شیعر

پەیکەرێک لە ئاگر
لەنێو دەریاچەیەکی نارنجی
بەبێ دەنگی
مەرکانە خۆڵەمێشییەکانی نێو خەوناکانم
پڕدەکات لە زەردەخەنە
دەسکە گوڵێکی ئاویش
لەسەر تابووتی وەرزە جوانەمەرگبووەکانم
جێدەهێڵێت
هەندێ شەویش

ڕەنگە خەوتووەکانی با
تێکەڵ بە فرمێسکەکانی خاک دەکات
تابلۆیەک دەنەخشێنێ
بەرینتر لە کیشوەرەکانی شیعر
لە سوچێکی نێو تابلۆکە
ڕەنگەکان سەما دەکەن و
دنیاش یەکپارچە دەهەژێ
ڕەشەبای بیابان و
سەوزەبای نێو باخچە و
سوورەبای ئەستێرەکان و
زەردەبای نێو خۆرەتا
هەموویان بەیەکەوە هەڵدەکەن ... !

٢

لە سوچێکی نێو تابلۆکە
گۆڕستانێک دەبیندرێت
خەڵک بە ( گۆڕستانی نیشتیمان )
ناوی دەبەن
لە ناوەڕاستی تابلۆکەش
باران دەبارێت
بەڵام ناگاتە زەوی و
لێوی درەختەکان تەڕ ناکات
زەویش وەکو باڵندە دەفڕێت
مرۆڤەکانیش وەک تۆز و با
هیچ بنارێک و دەربەندێک نایانگرنە خۆ
لە باشووری نێو تابلۆکەش

لە یەکێک لە شەقامەکان
« مۆزارت » خەمناکانە
کەمانجە دەژەنێ و
چەند کۆترێکی سپیش بە دیاریەوە هەڵکورماون
پیرەمێردێکی گوڵفرۆشیش بە تەنیشت مۆزارتەوە
بە دیار سەبەتەیەکی پڕ لە گوڵی
سوور و زەرد و سپی
بەنێو بیرەوەریەکانی ڕۆچوبوو
لە شەقامێکی تری نیو باشووری تابلۆکەدا
کچێکی بەفرینم بینی
لە بەفر سپیتر بوو
هەردووک مەمکەکانی خۆی
خستبووە نێو توورەگەیەکەوە
نەرنەرمیش بە تەنیا پیاسەی دەکرد

بە بێدەنگی بەدەم ڕێوە
بۆخۆی گۆرانی دەگوت و
دەیوت
( من بەدوای دەرگایەک دا دەگەڕێم
تا بەرلەمردن
بچمە نێو ژیانەوە ...! )

## ٣

لەلای خۆرهەڵاتی تابلۆکە
سێ دیمەن دەبیندران
دیمەنی یەکەم : شارێکی خاپوور و وێرانکراو
ئاسمانی شارەکە دوکەڵاوی و ڕەش دەچووەوە
لەولاوەش
لاشەی چەند سەربازێک لە نێو گۆڕەپان و کۆڵانەکان دەبیندران

چاوەکانیان بە نەرمی لەسەریەک دانابوون
وەک ئەوەی کە خەون ببینن

دیمەنی دووەم : منداڵێک لە تەنیشت لاشەی دایکیەوە
بە سیمایەکی گریاناوی مردبوو
تەنوورێک لە حەوشەی ماڵەکە ئاگرەکەی کزکز دەسووتا
لە نێو تەنوورەکەش نانێک دەبیندرا
نیوە سووتا و نیوە نەبرژاو

دیمەنی سێیەم : وێنەی خاچێک لەسەر گومبەزی کەنیسەیەک
بەلاولاوەی ڕەش داپۆشرابوو
لە ژوورەوەش تابلۆیەک لە پەرییەکانی بەهەشت
بەڕووتی
لەژێر دارسنەوبەرێک ڕاکشابوون

## ٤

دوێنێ دوای نیوەڕۆ
لەنێو نیگا شەرمنەکانی سێبەری گیا
لەنێو ڕووتبوونەوەی
یادەوەریەکانی پەپوولەیەکی منێ
دوای ڕاهەژاندنی
چەند وشەیەکی کۆرپە
لەنێو بێشکەکانی عەشق
ئاگرم لە سێبەری خۆم و
لە گەڵاکانی ئەڤینی بەردا
هەر ئەو ڕۆژە
لەنێو خەیاڵی
ئاوارەبوونی کیشوەرێکی وەهمی

ڕەنگی وێنە شیعریەکانم و
ژیان و ئایندەی خۆم و
عەشق و غەریبی و مردنم
با مانیفێست کرد !

٥

بەبێدەنگی
لەبنار مەمکە ماسۆشییەکانی ژیان
ڕاکشام
خۆم بە چەرچەفە ئاوریشمییە نەرجسییەکانی
ئاگر داپۆشی
بەر لە خەوتن
ئایەتەکانی غروربوونی خۆم و مردنم خوێندەوە

لەبیرمایە
خەونەکانم سوور سوور و
پڕلافاو بوون ئەوشەوە !

**ناوەڕاستی ئەیپریلی ٢٠٠٩**

# با بڕۆینەماڵەوە گوڵم

با ئەم ماڵەی غوربەتمان جێ بهێڵین
کە هەموو بەهارێکی
پڕە لە هەڵوەرینی گەڵاکانی عەشق
هەموو شەوانێکی
پڕە لە مردنی سەمفۆنیا هێمنەکانی ژیان و
لە مردنی شیعر و لە موعجیزەی چراکانی خەیاڵ
هەموو نیگارێکی
پڕە لە سووتانی پەڕەمووچەی باڵەکانی تەمەن

با بڕۆینەماڵەوە گوڵم
هەموو شتە جوانەکانیش لەگەڵ خۆمان ببەین
هەموو سەما و نۆتە و گۆرانییەکانی ئاو
فرمێسک و شەونمی سەر گۆناکانی درەخت
دەرکەوتنی خۆرەتاوێک لە مانگی بەفرانباردا
بەیانییەکی سکپڕ لە کۆتایی سیپتەمبەردا
دوای نیوەڕۆیەکی شەڕابی
لە ئاداری نێو وەرزەکانی غوربەتدا
نافوورەیەکی ڕەنگاوڕەنگی
نێو چوارڕیانەکانی ڕەشەبادا
با بڕۆینە ماڵەوە گوڵم
هەموو شتە /
نەوڕەسییەکان و ڤینۆسییەکان و ئیرۆسییەکانیش

لەگەڵ خۆمان ببەین
بەس پیربوونی ئاگر و مردنی لیمۆیە سەوزەکان و
خۆکوشتنەکانی دەریا .. نا
دەبا بڕۆینەوە
لێرە بەلەمەکانی نێو ئەندێشەمان
پڕە لە تۆز و غوبارەکانی مەرگ
لێرە وشەی نێو نامە دڵداریەکانمان لە بوونمان نامۆترن
لێرە مردن لە ژیان دەچێت ، ژیانیش لە شێتبوون و بێهوودەیی
لێرە ئەلبووم و وێنە و
بوخچەی خەیاڵەکانمان ، دیوانە شیعریەکانمان
پڕاوپڕن لە ڕەنگەکانی تاریکی / لە سووتماکەکانی زەردەخەنە
لێرە زمان لەبەر ڕەهێڵەی جوانی هەڵدەلەرزێ و نایەتە گۆ
لێرە پێکەنین / دارهەنارێکی نامۆیە بە باخچە
لێرە بەلەمی نیگاکانمان / کۆد و هێمای خەونەکانمان

هەموو پەژموردە و یەخسیرن
دەبا بڕۆینەوە گوڵم
لێرە نەک لە مانگ ، لە خوداش تەنیا ترین
دەبا بڕۆینەوە
لە ماڵەوە / دایکم لە چاوەڕوانیمان
چارۆگە سپییە بەفرینییەکەی
کردۆتە تارای سەربووکی ئومێدەکانمان
خاک لە چاوەڕوانیمان
بە فلوتێکی نارنجی
لاوکی ژیانەوەمان بۆ لێدەدا
درەختەکان لە چاوەڕوانیمان
ڕووت ڕووت لە ئامێزی بەیانیەکان ڕاکشاون
گەرهەکەکان لە چاوەڕوانیمان
ساپساپانێ بە خۆزگەکانی منداڵیمان دەکەن

کات لە چاوەڕوانیمان
بە ئاوسی وێنەی پەرتبوونەکانی
خۆرەتاوی لەسەر سینگی خۆی هەڵواسیوە
وەرزەکان لە چاوەڕوانیمان
قنج قنج سەما دەکەن و
مەمکەکانی خۆیان داوەتە بەر باران

دەبا بڕۆینەوە
لە ماڵەوە / لە پەنجەرە کراوەکانەوە
لە ئاگردانەکانی نێو هەناسەمان بڕوانین
کە پڕاوپڕە
لە خۆڵەمێشی خەونەکانمان
پڕاوپڕە / لە قورینگی پیربوون و
لە ئاهە ساردەکانی ونبوونمان
هەر لە پەنجەرە کراوەکانەوە

لە مەرگ و مردن و خۆکوشتنمان
لە هێلانە و هەیوان و هەوارگەکانمان بڕوانینەوە
لە تابلۆکانی تاریکی و
لە برین و لە خەمە کۆچەریەکانیشمان بڕوانینەوە
کە لەژێر ڕەشماڵەکان بە جێمان هێشتبوون
سڵاوێک لە پاکیزەیی پایزەکانمان بکەینەوە
سڵاوێکیش لە ڕووتبوونەوەکانی گوڵەگەنم و ئاویش بکەین
کە بە فانۆسەکانی جوانی و بە مۆمەکانی ژووری نووستن
ئاشنایان کردینەوە
لە مەستبوونەکانی شەو و لە سێبەرەکانی سپیدەش
نزیکیان کردینەوە
لەماڵەوە
ئەو کتێبە ئاسمانیانەش بخوێنینەوە
کە داستانەکانی عەشق دەگێڕنەوە و لە دەلاقەی
جێژووانەکاندا هەڵگیراون

ئەو کتێبانەش بخوێنینەوە
کە بە زمانی خۆڵەمێش نووسراون
لە دەلاقەکانی ئاگر هەڵگیراون
ئەو کتێبانەش بخوێنینەوە
کە بە زمانی بخوور نووسراون
لە دەلاقەکانی ڕووناکی هەڵگیراون
ئەو ئایەت و قەسیدانەش بخوێنینەوە
کە بە زمانی درەخت نووسراون
لە دەلاقەکانی ئاو هەڵگیراون
ئەو دەقانەش بخوێنینەوە کە باسی
وەڕسبوونەکانی کۆتر و نیگەرانیەکانی ماسی و ماسکەکانی
شاعیران دەکەن
سەیری کەڤاڵی ئەو قەدەرانەش بکەین
کە تیایدا / پەیکەرەکانی خودا و مەرگی منداڵەکان
لەیەک نیگاردا ڕەسم کراون

دەی دەبا بڕۆینەوە گوڵم
لەماڵەوە ، هەموو شەوانێک
گوێ لە مارشە وەهمیەکانی بروسکە ڕابگرین
بەیانیانیش / گوێ لە سروودە سوریالیەکانی کەڵەشێر و
گوێ لە بەستەکانی ڕاڕایی قاز و قورینگ و مراویەکان ڕابگرین
شیعریش بۆ سەرخۆشبوونی با و بۆ وڕێنەکانی
کچە کافرۆشەکان و ژنە نامووڕادەکانی درۆینە بنووسین
مەلۆتکەی مێژوو لەنێو بێشکەی گیایی ڕابژەنین
گۆڕستانەکانیش بە گوڵاو بڕشێنین / مردووەکانیش
هەڵسێنینەوە و لەگەڵ خۆماندا بیان بەین بۆ پیاسە
دەبا بڕۆینەوە / لە ماڵەوە
لە پەنجەرە کراوەکانەوە هەر بڕوانین
تا پڕبوون لە عەشق و لە ڕامووسانی و
لە چووزەرە نەرم و شلکەکانی.ڕەهایی

دەی دەبا بڕۆینەوە
بەرلەوەی شەومان بەسەردابێ و
دەرگەکانیشمان بە ڕوو دابخرێ
دەبا بڕۆینە گوڵم ،
دەی دەی دەی !

**سەرەتای تەمووزی ٢٠٠٩**

## ناوەڕۆك

## کتێبی (نیگایەک بەسە بۆ مردن) ٤٥٩



## کتێبی (لەسەر جەستەی ڕووتت لە خاچم دە) ٥٥٥